# زانستی پزیشکی

## بە زمانێکی ساکار

د. کامەران ئەمین ئاوە



# زانستی پزیشکیی بەزمانێکی ساکار

دکتۆر کامەران ئەمین ئاوە

پێداچوونەوە

هاوار هەڵەبجەیی

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **زانستی پزیشکی (بە زمانێکی ساکار)**
- نووسینی: دکتۆر کامەران ئەمین ئاوە
- پێداچوونەوە : هاوار هەڵەبجەیی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: رێمان
- ژمارەی سپاردن: (١٦٧) لەساڵی ٢٠١٣
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٤
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٨٠٤)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

بۆ دایک و باوکم

" سەڵتەنەت وەتەن پەرەست و  هەباس ئەمینئاوە"،

و کوڕە خۆشەویستەکەم

" ئەنوش"

# پێرست

## سەرەتای نووسەر  بۆ چاپی هەوەڵ

ئەم کۆمەڵە بابەتە پزیشکیی‌یە لە ماوەی ٥ ساڵی رابردوودا لە چەند گۆڤاری کوردیی وەکو "هاوار" لە ئالمان، "کوردستان" و"ڕێگای کوردستان" لە باشووری کوردستان، هەروەها سایتی "ڕۆژهەڵات ـ بۆکان"دا بڵاوبۆتەوە و ئێستا دوای بەسەردا چوونەوەو گۆڕانکاریی، بەڵام پێ‌زیاد کردن، وەک کتێب دەکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز.

هەندێک لەم بابەتانەم بە فارسیی نووسیون کە بەشێکیان وەکو: "نەخۆشیی شەکرە"، "سوود و زیانی جگەرەکێشان؟!"، "پشت‌ئێشە" و"نەخۆشیی‌یەکانی پڕۆستات"، لە لایەن بەڕێز دوکتور تاهیر حیکمەت،"کارەساتی جیهانیی ئێدز" لە لایەن گۆڤاری کوردستانەوە و " ئاکامەکانی کۆمەڵایەتیی و پزیشکیی زۆرخواردنەوەی ئەڵکۆڵ" (کحول) لەلایەن رێزدار کاک برایمی فەرشی‌یەوە کراونەتە کوردیی.

نووسەر، رێزو سپاسی خۆی ئاراستەی بەڕێزان دوکتور تاهیر حیکمەت، کاک برایمی فەرشی و مامۆستا حەسەنی ئەییوبزادە "گۆڕان" دەکات کە بە پێداچوونەوە، لە رازاندنی رستە و ساغکردنەوی هەڵەی رێزمانیی‌دا یاریی‌دەیان داوە.

دوکتور کامەران ئەمین‌ئاوە

## سەرەتای نووسەر
## بۆ چاپی دووهەم

ئەم کۆمەڵە بابەتە "پزیشکیی‌یە - کۆمەڵایەتیی"یانە وا لە ساڵی ٢٠٠٧ زایینیی‌دا بۆ یەکەم جار "دەزگای سپیریێز"ی دهۆک لە باشووری کوردستان چاپ و بڵاوی کردەوە، ئیستا جاریکی‌تر پاش بە سەردا چوونەوە، گۆڕانکاریی و زیادکردنی دوو بابەتی تازە، دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەر. نووسەری بابەتەکان تێکۆشاوە تا رادەی گونجاو بە زمانێکی ساکار باسی بەشێک لە نەخۆشیی‌یە دەروونیی‌یەکان، هەروەها گیروگرفتی کۆمەڵایەتی بکات کە بە تایبەتیی لاوان و تەنانەت بەشێک لە گەورەساڵانیش تووشیان دەبن.

نووسینی بابەتگەلی پزیشکیی و کۆمەڵایەتیی بە زمانی کوردیی نە تەنیا دەتوانی دەورێکی باشی لە بردنەسەرەوەی ئاگایی نێو کۆمەڵ و گەشەکردنی زمانی کوردیی‌دا هەبێ، بەڵکو نیشاندەرێ ئەم راستیی‌یەشە کە ئەم زمانە وەک هەر زمانێکی زیندووی جیهان ئامرازێکی شیاوە بۆ لێکۆڵینەوەی بوارە زانستیی‌یەکان و سەرەڕای کەم و کورتیی و نەبوونی وشە و زاراوەگەلی پێویست، دەکرێ کاری جیددیی زانستیشی پێ‌بکرێ.

کامەران ئەمین‌ئاوە

## نەخۆشیی دڵ



بە پێچەوانەی باوەڕی زۆربەی شاعیران و فیلەسوفە موسڵمانەکان کە دڵ بە ناوەندی هەست و ئەوین و دڵداری و وەرگری ئیلهام و سەرچاوەی ئیشراق و فامگەی خواناسیی دەزانن، دڵ تەنیا ماسولکەیەکە و ٢٤ کاتژمێر تا ئەو دەمەی کە مرۆڤ دوا هەناسەی هەڵدەکێشێ و ماڵئاوایی لە ژیان دەکا، وەکو ترۆمپایەک لە ڕێگای ڕەگەکانەوە خوێن ڕەوانەی تەواوی تان و پۆکانی[1] جەستە دەکا. ئەم مەسەلە ساکارە تا سەدەی ١٧ی زاییینیی بۆ زۆربەی دوکتوران و پسپۆڕانی زانستی پزیشکیی نەناسراو بوو. ئەوان باوەڕیان وابوو، کە خوێن بەرهەمی جەرگە و تەنیا یەک جار لە ڕێگای دڵەوە ڕەوانەی ئەندامەکانی جەستە دەکرێ و تا ئەو کاتەی کە لە لایەن تان و پۆکاندا بە تەواویی رادەکێشرێ، لەم شوێنەدا عەمبار دەکرێ.

1 Tissue

بە داخەوە لە مێژووی زانستی پزیشکیشدا بە تایبەت لە سەدەکانی نێوەڕاستی زایینییدا، کەسانێک کە لە راستییەکانی جەستەی مروڤ دەدوان، وەکو زۆربەی زانستەکانیتر، لە لایەن کۆنە پەرستانی کڵێساوە سەرکوت دەکران، دەکوژران یان بێ حورمەتیی و سوکایەتییان پێ دەکرا.

بۆ وێنە لە سەدەی ١٦ی زایینییدا ئەو کاتەی کە میکائیل سێرڤەتوس[2] بەهۆی راگەیاندنی ئەم بابەتە ساکارە کە خوێن لە بەشی راستی دڵەوە دوای تێپەڕبوون لە سییەکان دەگاتە بەشی چەپی دڵ و لە رێگای دەمارەکانەوە رەوانەی ئەندامەکان دەکرێ، بەفەرمانی کلیسا لە ئاگردا سوتێندرا.

## پەتاناسیی[3]

پاش شۆڕشی پیشەسازی نە تەنیا ئاڵوگۆڕێکی گەورە لەشێوەی بەرهەمهێنان، ژیان و کولتور، بەڵکو گۆڕانکاریی گەورەش لە جۆری نەخۆشییەکان، بەتایبەتیی لەوڵاتانی پێشکەوتودا سەری هەڵدا. لە سەدەی ٢٠ی زایینییدا بۆ وێنە ئازاری دڵ و رەگەکان هۆی یەکەم و شێرپەنجەکان هۆی دووهەمی مردنی خەڵک لە وڵاتانی پیشەسازیی پێشکەوتودا بوون و لە سەدەی ٢١ - یشدا ئەم رەوتە هەروەها بەردەوامە. تەنیا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پتر لە ٦٠ میلیۆن کەس (لە هەر پێنج کەسدا یەک نەفەر) تووشی "نەخۆشیی خوێنبەرەکانی کرۆنێریی دڵن[4]"(خوێنبەرەکانی کرۆنێریی خوێن بە دڵ دەگەیەنن) و ساڵانە پتر لە یەک میلیۆن کەس تووشی سەکتەی کتوپڕی دڵ دەبن.

---

2 Michael Servetus (1511-1553).

3 Epidemology

4 Coronary heart disease

**نیشانەکانی نەخۆشییدڵ و ڕەگەکان**

لــە نەخۆشــەکانی دڵ و ڕەگەکانــدا بــە پێــی ڕادەی نەخۆشــیی، ئــەو نیشانانەی خوارەوە دەبیندرێ:

- پشووسواریی[5] لە کاتی وەرزش یا پشووداندا،
- ماسینیی مەچەک و قامیشەی پێ،
- سنگ ئێشە[6]،
- گێژی و بێهۆشی،
- دڵەکوتە[7].

ئـەم مەسـەلەیە دەبـێ لـە بـەرچاو بگیـرێ کـە ئـەم نیشـانانە دەتـوانن لـە نەخۆشییەکانی دیکەشدا ببیندرێن.

**پشووسـواریی**: ئـەم حاڵەتـە لـە کـاتی وەرزش و کـاری قـورس بـە هـۆی ئـەوەی کـە ماسـولکەکانی جەسـتە پێویسـتیی زۆرتریـان بـە ئۆکسـیژن هەیـە، ئاسـاییە، بـەڵام لـە حاڵـەتی پشـوودان، کـار و ورزشـی سـووکدا، ڕەنـگە نیشـانەی ناڕەحـەتیی دڵ یـان سـییەکان بـێ. نـاتەواویی دڵ سـەرەکییترین هۆی پشووسوارییە. دڵ ناتوانێ بە گوێرەی پێویست، خوێن بۆ ئەندامـەکان ڕەوانە بکا، خوێنێکی کەمتر دەگاتـە سـییەکان ولـە ئاکامـدا سـیپەلک نـاتوانێ بە گوێرەی پێویست ئۆکسـیژێن بـۆ گـەڕانی خـوێن[8] بنێرێ و تراوێکی[9] زۆر لە سییەکاندا کۆ دەبێتەوە وپشووسواریی پێکدێ.

5 Dyspnea
6 Angina pectoralis
7 Palpitation
8 Blood circulation
9 Fluid

**ماسینیی مەچەک و قامیشەی پێ** نیشانەی کۆبوونەوەی تراو لە" تان و پۆکان"دایە. ناتەواویی دڵ سەرەکییترین هۆی ئەم حاڵەتەیە. لەم حاڵەتەدا کاری پۆمپاژی دڵ لاواز دەبێ و بەشی چەپی دڵ توانای ناردنی تەواوی ئەو خوێنەی کە لە دڵدایە، نییە و بە تەواویی خوێن بەتاڵ ناکرێ، لە بەشی راستی دڵیشدا خوێن قەتیس دەمێنێ و دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری نێوگەڕانی خوێن و ناردنی" تراو" بو نێو تان و پۆکان. ماسینیی مەچەک و قامیشەی پێ بە هۆی هێزی کێشەری زەوی کە تراو بەرەو خوار دەکێشێ، زۆرتر دەبیندرێ.

**سنگ ئێشە** یەکێک لە سەرەکیترین نیشانەکانی نەخۆشیی دڵە کە لە بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین.

**گێژیی** بۆماوەی چەند چرکە شتێکی ئاسایی و بی ئازارە، بەڵام وێدەچێ دووپاتبوونەوە و بەردەوامیی ئەم حاڵەتە نیشاندەری ناکۆکیی کاری دڵ و رەگەکان بێ.

**بێ هۆش بوون**. نەگەیشتنی کاتیی خوێن بە مێشک دەبێتە هۆی بێهۆشبوونی کورتخایەن. راوەستانی درێژخایەن لە هەوای گەرمدا، ئیشی زۆر و راتەکانی[10] لە نەکاو لە هۆیەکانی بێ هۆشبوونی مرۆڤن. جاروباریش ناڕەحەتیی دڵ وەک راوەستانی دڵ دەبێتە هۆی نەگەیشتنی خوێن و ئۆکسیژێن بە مێشک. بێهۆشبوونی کورتخایەن لە کاتی وەرزشدا دەتوانێ نیشاندەری ناڕەحەتیی و نەخۆشیی دڵ بێ.

---

10 Shock

## سنگ ئێشە



ئانژین[11] یا " ئێش" سەرەکیی‌ترین نیشانەی نەخوشیی کرۆنێریی دڵە[12] کە لە کاتی وەرزش، کاریهێزکوژ(سەخت)، زۆرخۆریی و فشاری رۆحیی لە نێوەوەی رکەی سنگدا هەستی پێدەکرێ.

سنگ ئێشە بەهۆی لاسەنگیی نێوان گەیشتنی ئۆکسیژێن بە ماسولکەی دڵ و خواست و پێویستیی کاری دڵ بە ئۆکسیژێن پێکدێ. نەگەیشتنی ئۆکسیژن بەماسولکەی دڵ دەتوانێ بە هۆی تەنگبوونەوە یا گرژیی[13]خوێنبەری کرونێریی دڵ، کەم خوێنیی[14]، کەم بوونەوەی ئۆکسیژێنی جەستە[15] یا

11 Angina
12 Heart Coronary Disease
13 Spasm
14 Anemia
15 Hypoxia

خواستی دڵ بە ئۆکسیژێنی زیاتر لە کاتی خێرالیدانی دڵ[16] چڵک یا نەخۆشیی تیروئید وەک تیرۆتۆکسیکوز[17] بێ.

**هۆکارەکانی نەخۆشیی کرۆنێری دڵ:**

- بەرزبوونی فشاری خوێن،
- نەخۆشی شەکرە (قەند)،
- زیاد بوونی چەوریی خوێن (بەرزبوونی کۆلسترۆڵی خراپ "LDL" و کەم بوونی کۆلسترۆلی باش "HDL")،
- فاکتەری بنەماڵەیی یان بۆماوەیی( هەبوونی نەخۆشیی دڵ بەتایبەتیی لە دایک و باوکدا)،
- جگەرە کێشان،
- چوونەسەریی تەمەن( پیاوان دوای ٤٥ ساڵ و ژنان دوای ٥٥ ساڵ)،
- رەگەزی نێرینە،
- قەڵەویی - ئەو کاتەی کە قورسایی جەستە لە سەدا ٣٠ی بنەما تێپەڕێ،
- داتەپیویی (تەمبەڵی)،
- خەمۆکیی[18] بەتایبەتیی لەپیاواندا،
- خواردنی چەوریی،
- ژنان دوای عوزرنەشوتن( یائسەگی) بەهۆی کەم بوونەوەی هۆرمۆنی ژنانەی ئسترۆژێن ( بەکارهێنانی هۆرمۆنی ئسترۆژێن ئەم مەترسیی‌یە تا رادەیک کەم دەکاتەوە)،

---

16 Tachycardia
17 Thyrotoxicosis
18 Depression

- کەڵک وەرگرتن لە کۆکائین (بۆ وێنە لە ئەمریکا پتر لە ٥ میلیۆن کەس کوکائین بە کار دێنن. ساڵانە پتر لە٦٤٠٠٠ هەزار کەس بەم هۆیەوە تووشی نارەحەتیی کرۆنێریی دڵ دەبەن).

**نیشانەکانی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ:**

- سەرهەڵدانی ئێش لە لای چەپ یان نێوەڕاستی چەڵەمەی سنگ لە کاتی کار یان نائارامییدا. بەردەوامیی ئێش لەچەند خولەکەوە تا ٣٠ خولەک دەخایەنێ و بە پشوودان و یان چەشتنی نیترۆگلیسیرین کۆتایی پێ دێ.
- ئێش بەرەو مل، دەست و دەفەی شانی چەپ دەکێشرێ و لە کەسانێکدا پشووسواریی، ئارەقەکردن، سەرئێشە و دڵ تێکەڵی دەهێنێ.
- جاروبار پشووسواریی تەنیا نیشانەی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵە.
- لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا هیچ نیشانەیک نابیندرێ.

**چارەسەریی:**

بۆ پێشگیریی لە مەترسیی پێکهاتنی نارەحەتیی کرۆنێریی دڵ پێش هەموو شتێک دەبێ هۆکارەکانی کۆنترۆڵ بکرێ. پێشنیار دەکرێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بەرچاو بگیرێ:

- نەکێشانی جگەرە،
- وەرزشی بەردەوام ( پیاسەکردنی خێرا بۆماوەی نیو کاتژمێر، چوار جار لەحەوتودا)،
- دابەزاندنی قورسایی جەستە،
- کۆنترۆڵی کۆلسترۆلی خوێن،
- کۆنترولی فشاری خوێن،
- کۆنترۆڵی شەکرەی خوێن،

- دەرمانی ئەو نەخۆشییانەی کە دەبنە هۆی خراپتر و زۆرتر کردنی ئیشی دڵ ( وەکو کەم خوێنیی، دابەزینی ئۆکسیژێنی لەش، پڕکاریی تیروئید).

چارەسەرکردنی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ گرێدراوە به رادەی بەسترانی خوێنبەرەکانی کرۆنێریی و هۆکارەکانی پێکهاتنی گرفتەکە، کە لە ئاکامدا بە نەشتەرگەریی چارەدەکرێ. ئامانجی سەرەکیی لە بە کارهێنانی دەرمان بەچەشنی خوارەوەیە:

**کاریگەریی دەوا و دەرمان:**

- بەرزکردنەوەی ئاستی گەیاندنی ئۆکسیژێنی پێویست بە دڵ لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کە دەبنە هۆی کرانەوەی خوێنبەری کرۆنێریی دڵ، وەکو نیترۆگلیسیرین[19].
- کەمکردنەوەی پێداویستیی دڵ بە ئۆکسیژێن لە ڕێگای کەم کردنەوەی کاری دڵ بە پێدانی دەواگەلێک وەکو پرۆپرانۆلۆل[20].
- گەیاندنی ئۆکسیژێنی پێویست بە دڵ یان هێنانە خواریی پێداویستیی دڵ بە ئۆکسیژێن بە یارمەتی دەواگەلێک وەکو وراپامێل[21]

**بۆ دەرمانی ئەو کەسانەی کە:**

- لەسەدا ٥٠ی خوێنبەری سەرەکیی لای چەپی دڵیان بەسترابێ،
- نەخوشیی ٣ ڕەگیان بێ (پتر لەسەدا ٧٠ی بەسترابێ)،
- لە پێوەندیی لەگەڵ هاتنەخوارەوەی کاری بەشی چەپی دڵدا بن،
- بە تازەیی تووشی سەکتەی دڵ بووبن،

---

19 Nitroglycerin
20 Propranolol
21 Verapamil

- سەرەڕای بەکارهێنانی دەوا(دەرمان)، لە حاڵەتی پشووداندا ئێشی بەردەوامی دڵیان بێ،




- لێرەدا لە نەشتەرگەریی بایپەس[22] و یا ئانژیوپلاستیی(باڵون)[23] کەڵک وەردەگیرێ. لە ئانژیۆپلاستییدا لە ڕێگای خوێنبەرێکی دەست یان لاڕان کاتێترێکی باڵۆندار دەکرێتە نێوخوێنبەری کرۆنێر و بە باکردنی باڵۆنەکە ئەم ڕێگایە دەکرێتەوە.

---

22 Bypass surgery
23 Angioplasty

# سەکتەی دڵ[24]




**بـە پێـی ڕاگەیانـدنی ڕێکخـراوی تەندروسـتیی جیهـانی" لـە هـەر ٥ چرکەیەکدا، لە جیهان نەفەریک تووشی سەکتەی دڵ دەبێ". ساڵانە پتر لە یەک میلیۆن کەس لە ئەمریکا، زۆرتر لە١٨٠ هەزار نەفەر لە بریتانیا و نزیک بە٢٥٠ هەزار کەس لە ئاڵمانیا تووشی سەکتەی دڵ دەبن. لە سەدا ٣٠ تا ی٤٠ ئەم نەخۆشانە لە ماوەی ١ تا ٤ حەوتوی ئەوەڵدا دەمرەن. سەکتەی دڵ بە تایبەتیی پاش تەمەنی ٥٠ ساڵ زۆر باوە و بە پێی چوونەسەرەوەی تەمەن، ڕێژەی مەترسیی سەکتەی دڵ زۆرتر دبێ. سەکتەی دڵ لە پیاواندا ٣ جار زۆرتر لە ژنان.**

بـە بەسـترانی خوێنبـەری کرۆنێریـی ونەگەیشـتنی خـوێن بـە بەشـێک لـە ماسولکەی دڵ کە دەبێتە هۆی مردنی تان و پۆی دیواری دڵ – سـەکتەی دڵ دەگوترێ. ئاکامی سەکتەی دڵ بە پێی پانـایی بێ بـەش‌بوونی ماسـولکەی دڵ لـە ئۆکسـیژێن و ڕادەی تەنگبوونـەوەی خوێنبـەرەکانی کرۆنێریـی جیـاوازە.

---

24 Myocardial Infarction

ئەگەر خوێنبەری سەرەکیی دڵ بەسترابێ، بەشێکی گەورە لە ماسولکەی دڵ تووشی ئازاردەبێ، وێدەچێ نەخۆش دوای چەند خولەک بمرێ، بەڵام ئەگەر رادەی تەنگبوونەوەی خوێنبەر کەمتر بێ یان تەنیا خوێنبەرە بچووکەکان بگرێتەوە، بەشێکی کەمتر لە ماسولکەی دڵ زیان دەبینێ، وێچوونی زیندوومانەوەی نەخۆش بەرزترە.

**هۆکانی سەکتەی دڵ:**

- ئەستوور و رەق بوونی خوێنبەری کرۆنێریی،
- گرژیی خوێنبەری کرۆنێریی (ئەم حاڵەتە زۆرتر لە خووپێگرتوو بەکۆکائین و یا ئامفیتامین - دا[25] روو دەدا)،
- ئامبۆلی کرۆنێریی (بۆ وێنە جیابوونەوەی دەڵەمەی خوێن لە دیوارەی رەگەکان و رۆیشتنی بەرەو دڵ دەتوانێ ببێتە هۆی بەستنی خوێنبەری کرۆنێریی)،
- هەوی خوێنبەری کرۆنێریی وەکو ئاکامی نەخۆشیی روماتیسمیی جومگە[26]
- بەرزبوونەوەی خەستیی خوێن وپێکهاتنی دەڵەمەی خوێن.

بۆ ئاگاداری لەهۆکارەکانی ریسک بڕوانە بەشی " سنگ ئێشە".

**نیشانەکانی سەکتەی دڵ:**

- ئێش. لە سەتا ٦٠ هەتا ٦٥ی بوارەکاندا، نەخۆشەکان دوای کاری جەستەیی و لەکاتی پشووداندا تووشی ژانێکی کتوپڕ لە پشت چەڵەمەی

---

25 Amphetamine
26 Rheumatoid arthritis

سنگ دەبن. ئەم ئێشە بۆماوەی پتر لە نیو کاتژمێر درێژە پەیدا دەکات و بە خواردنی نیترۆگلیسرین کۆتایی پێنایە.

- ئیش دەتوانێ بەرەو نێوان دەفەی دوو شان، هەر دوو دەست، مل، شەویلکەی خوارێ، پشت و گەدە تەشەنە بکا.
- دڵ تێکەڵبوون،
- ڕشانەوە،
- پشووسواریی،
- دڵەکوتە،
- سەرەگێژە،
- یاو(تا)،
- بێهۆشبوون،
- ئارەقە، هەروەها دڵەڕاوکە و ترس لە مردن، لە نیشانەکانی سەکتەی دڵن.

**لە سەدا بیستی ئەو کەسانەی کە تووشی سەکتەی دڵ دەبن هەست بە ئێش ناکەن بە تایبەتیی ئەوانەی کە نەخۆشیی شەکرەیان هەیە.**

**لەسەدا پازدەی نەخۆشەکاندا هیچ نیشانەیک نابیندرێ. ئەم حاڵەتە لە ژناندا زۆرترە.**

**چارەسەریی:**

نەخۆش بە هەستکردنی ئەم نیشانانە دەبێ هەرچی زووە پێوەندیی بکات بە دوکتور یان بەشی فریاکەوتنی پزیشکیی. چارەسەرکردنی خێرای ئەم حاڵەتە دەتوانێ باشترین ئاکامی ساغی و سەلامەتی بە دواوە بێ.

**پێویستە ئەو کارانەی خوارەوە بەخێرایی لە لایەن دوکتورەوە ئەنجام بدرێن:**

خـواردنی ئاسـپرین بـۆ کەمکردنـەوەی خەسـتیی خـوێن و پێشـگیریی لەپێکهاتنی زۆرتری دەڵەمەی خوێن،
گەیاندنی ئۆکسیژێن لە ڕێگای لوتەوە،
بـــەکارهێنانی نیترتەکـــان وەک نیترۆگلیســـیرین بـــۆ کـــەمکردنەوەی ژان وگرژیی خوێنبەری کرۆنێریی و گەیاندنی ئۆکسیژێنی زۆرتر بە دڵ،
ئازارشکێنی بە هێز وەکو مۆرفین[27]،
دەوا وەکو ستریپتوکیناز[28] بۆ لە نێوبردنی دەڵەمـەی خـوێن و کردنەوەی ڕێگای خۆێنبەر،
هێپارین[29] بۆماوەی چەند ڕۆژ بۆ پێشگیریی لە پێکهاتنی دەڵەمەی خوێن،
کاپتۆپریـــل[30] بـــۆ کردنـــەوەی خوێنبـــەر و گەیانـــدنی خـــوێن بـــە دڵ، کەمکردنەوەی فشاری خوێن وهێنانەخوارەوەی ڕێژەی مردنی نەخۆش،
مێتوپرۆڵـول[31] بـۆ هێنانـەخوارەوەی پێداویسـتیی دڵ بـە ئۆکسـیژێن، هەروەها ڕێکوپێککردنی کاری دڵ،
ئانژیۆپلاسـتیی بـۆ پێشـگریی لـە بەسـترانی خوێنبـەری کرۆنێریـی و لـەنێوبردنی دەڵەمـەی خـوێن. لـە ڕێگـای خوێنبـەرێکی دەسـت یـان لاڕان کاتێترێکی باڵۆندار دەکرێتە نێو خوێنبەری کرۆنێریی و بە باکردنی باڵۆنەکە ئەم ڕێگایە دەکرێتەوە،
کەمکردنـەوەی هـەر چەشـنە چالاکیيـەکی نـەخۆش بـە تایبـەتیی لـە ٢٤ کاتژمێری هەوەڵدا،
دەوای هێمنکەرەوە بۆ هێدیکردنەوەی سام و پەشێویی.

---

27 Morphine sulphate
28 Streptokinase
29 Heparin
30Captopril
31Metoprolol

**چەند پێشنیار:**

کەسانی بە تەمەن کە نەخۆشیی دڵیان هەیە، باشترە بە تەنیایی لەماڵێک نەژین و هەمیشە لە گەڵ خزم وکەسیان بژین، تا لە کاتی پێویستدا یارمەتیی بدرێن.

ئەوانەی کە بە تەنیای دەژین، جیرانەکانیان سەبارەت بە نەخۆشیی خۆیان ئاگادار کەن و لە کاتی مەترسیی سەکتەی دڵدا، داوای یارمەتی لەوان بکەن.

ژمارە تەلەفۆن دوکتور و بەشی فریاکەوتن لە بەر دەستیان بێ تا لە کاتی هەست بەمەترسیی سەکتەی دڵ داوای یارمەتیی بکەن.

لە ژێر چاودێریی و کۆنترۆڵی بەردەوامی دوکتوردا بن.

**پێشگیریی:**

گۆڕانی شێوەی ژیانی نەخۆش، هەروەها ئەو کەسانەی کە نایانەوێ لە داهاتودا تووشی نەخۆشیی دڵ بن، دەتوانێ دەورێکی بەرچاو بۆ پاراستنی ساغ و سەلامەتی بگێڕێ. لەبەر ئەمەش لە بەرچاوگرتنی خاڵەکانی خوارەوە پێویستە:

گرتنی رژیمێکی درووستی خواردن،
جووڵان و هەڵسوران بەتایبەت وەرزش کردنی بێپسانەوە،
کۆنترۆڵی قورسایی جەستە،
وەلانانی جگەرە،
کۆنترۆڵی فشاری خوێن،
کۆنترۆڵی شەکرەی(شەکرە) خوێن،
کۆنترۆڵی سترێس(دڵەڕاوکێ)،
خواردنی حەبی هێنانەخوارێی کۆلسترۆل.

## ناتەواویی دڵ



لـە سـەرەتادا بـۆ تێگەیشـتنی باشـتر لـە میکـانیزمی نـاتەواویی دڵ[32] بـە کورتی باسی پێکهاتەی دڵ و ڕۆیشتنی خوێن دەکەین. دڵ بە هـۆی دیـواری نێوەڕاسـتییەوە[33] بـە دوو بەشـی ڕاسـت و چـەپ دابـەش دەکـرێ. لەهـەر بەشـێکی دڵـدا دوو دیـو[34] و دوو دەریچـە هەیـە. بە دیوەکـانی سـەرەوەی دڵ داڵان[35] و بە دیوەکانی خوارێ سکۆڵە[36] دەڵێن.

32 Failure Heart
33 Septum
34 Chamber
35 Atrium
36 Ventricle

خوێن پاش هەر لێدانێکی دڵ لە لای چەپی دڵەوە دەڕژێتە نێو گەورە دەمـاری "ئـائۆرت" و لەوێشـەوە لـە ڕێگـای خوێنبەرەکانـەوە[٣٧] دەگاتـە ئەندامەکانی‌تری جەستە و ئۆکسیژێن‌یان پێ دەگەیەنێ.

خوێن پـاش پێـدانی ئۆکسـیژێن بـە ئەندامـەکان و هـەڵمژینی کـەربۆن دی‌ئوکسید بە یارمەتیی خوێنهێنەرەکان[٣٨] بەرەو دڵ دەگەڕێتەوە ولە ڕێگای دوو کلۆرە خوێنهێنەری سەروو و خواروو[٣٩] دەڕژێتە نێو بەشی راستی دڵ.







پاش هەر لێدانێکی دڵ، خوێنی لای راستی دڵیش دەڕژێتە نێو خوێنبەری سـیپەلکیی[٤٠] و لەوێشـەوە رەوانەی سـیی‌یەکان و بەشـی چـەپی دڵ دەکـرێ. خوێن لە کاتی تێپەڕبوونی لە سیی‌یەکان، پاش پێدانی کەربون دی‌ئۆکسید لـە لایەن سیی‌یەکان و هەڵمژینی ئۆکسیژێن، خاوێن دەبێتەوە.

لەکاتی پشوودانداندا نزیک بە ٥ لیتر خوێن لەڕێگای دڵەوە پۆمپاژ دەکرێ.

* * *

37 Arteries
38 Veins
39 Superior&inferior vena cava
40 Pulmonary artery

لەئەنجامی زۆربەی نەخۆشییە درێژخایەنەکانی دڵ، کاری پۆمپاژکردنی دڵ دەشێوێ و دڵ ناتوانێ خوێنی پێویست بۆ ئەندامەکان بنێرێ، بەم حاڵەتە **ناتەواویی دڵ** دەگوترێ. لە ناتەواویی دڵدا نیسبەتی خوێنی گەڕاوە بۆ دڵ زۆرترە لە خوێنی پۆمپاژکراو. ئەمە دەبێتە هۆی پۆنگخواردنەوەی[41] نێو دڵ، نەگەیشتنی خوێنی پێویست بە ئەندامەکانیتری جەستە و گەڕانەوەی خوێن لە لای چەپی دڵەوە بۆ خوێنهێنەری سیپەلکیی[42].

پۆنگخواردنەوە و بەرزبوونی فشاری نێو خوێنهێنەری سیپەلکیی دەبێتە هۆی چوونی بەشیک لە شلەئاوی خوێن بۆ نێو سییەکان وماسینی ئەوان[43]. ئەم حاڵەتانە ئاکامی ناتەواویی بەشی چەپی دڵە[44]. تێکچوونی هێزی پۆمپاژکردنی بەشی راستی دڵ دەبێتە هۆی پۆنگخواردنەوەی دیوەکانی بەشی راستی دڵ و گەڕانەوەی خوێن بەرەو خوێنهێنەرەکان.

پۆنگخواردنەوە و چوونەسەرەوەی فشاری نێو خوێنهێنەرەکان دەبێتە هۆی چوونی بەشێک لە شلەئاوی خوێن بو نێو تان و پۆی ئەندامەکان و ماسینی ئەوان. ئەم حاڵەتە ئاکامی ناتەواویی بەشی راستی دڵە[45].

ناتەواویی دڵ نەخۆشییەکی درەیژخایەنە و ئەمە بەو واتایەیە کە بەرە بەرە کاری دڵ لاوازتر و خراپتر دەبێ. دڵ بۆ ئەوەی بتوانێ خوێنی پێویست بۆ ئەندامەکان بنێرێ تووشی گۆڕانکاریی وەک هەراویی دیوەکان و ئەستووربوونی ماسولکە دەبێ. ئەم دوو حاڵەتە لە سەرەتادا دەبنە هۆی گرژبوونی بە هێزتری دڵ و ناردنی خوێنی پێویست بۆ ئەندامەکان، بەڵام لە ئاکامدا کاری دڵ لاوازتر و بێ هێزتر دەکەن.

---

41 Congestion
42 Pulmonary vein
43 Pulmonary edema
44 Left-sided heart failure
45 Right-sided heart failure

**هۆیەکانی ناتەواویی دڵ:**

نەخۆشیی خوێنبەری کرۆنێریی دڵ،

سەکتەی دڵ،

بەرزبوونەوەی فشاری خوێن،

نائاسایی بوونی دەریچەکانی دڵ،

نەخۆشیی ماسولکەی دڵ[٤٦]،

هەوی ماسولکەی دل[٤٧] ،

نەخۆشیی زگماکیی دڵ،

نەخۆشیی گرژیی سییەکان،

نەخۆشیی قەند،

کەم خۆێنیی،

پڕکاریی تیرۆئید،

ئاریتمیی.

**نیشانەکانی ناتەواویی دڵ:**

پشووسواریی لە کاتی چالاکیی، پشوودان و یا خەوتندا،

کۆخەی بەردەوام یا سیخەی سنگ[٤٨]،

ماسینی لاقەکان، مەچەکی پێ و زگ،

ماندوویی بەردەوام بە تایبەتیی لە کاتی پیاسە و هەر چەشنە کارێکی فیزیکیی‌دا،

بێئیشتیدایی،

دڵ تێکەڵاتن،

46 Cardiomyopthy
47 Myocarditis
48 Wheezing

سەرگێژە و شێواویی[49] بەهۆی گۆڕینی ڕێژەی سۆدیومی خوێن،
چوونەسەرەوەی رادەی لێدانی دڵ،
سنگ ئێشە.

**چارەسەریی:**

لە پلەی هەوەڵدا پێشنیاردەکرێ نەخۆش شێوەی ژیانی خۆێ بگۆڕێ و خاڵەکانی ژێرەوە لە بەرچاوبگرێت:

١. وەلانانی جگەرە،
٢. وەلانانی کحول،
٣. هینانەخوارێی قورسایی جەستە،
٤. کۆنترۆڵی فشاری خۆین،
٥. کۆنترۆڵی چەوریی خۆین،
٦. کۆنترۆڵی شەکری خوێن،
٧. کەم کردنی خوێ لە خۆراکی رۆژانەدا،
٨. نەخواردنی کافائین،
٩. دووری لە هەر چەشنە سترێس(دڵەڕاوکێ).

**دەوا و دەرمان:**

ئامانجی سەرەکیی دەوا و دەرمان کەم کردنەوەی نیشانەکانی[50] نەخۆشیی و هێنانەخوارەوەی ڕێژەی مردنی نەخۆشە. کاریگەریی دەواکان بریتین لە ژیانەوە، پاراستنی کاری ئاسایی دڵ و کەم کردنەوەی ماسینی سییەکان. بەم مەبەستە ئەم دەوایانە بە پێی هۆ، پلە و

---

49 Confusion
50 Symptoms

ڕاده، نیشانه و شێوانی کاری تایبەتیی دڵ لە ژێر چاودێری دوکتوردا بە کار دەبردرێن:

هیدرالازین[51] و کاپتۆپریل بۆ هەراویی دەمارەکان، باشتر ڕۆیشتنی خوێن و هینانەخوارەوەی فشاری خوێن.

میزهێنەر[52] وەکو فوراسیمید[53] بۆ کەمکردنەوەی ماسینی سییەکان و لاق.

دیگۆکسین[54] بۆ بەرزکردنەوەی هێزی گرژبوونەوەی دڵ و ناردنی خوێن بۆ ئەندامەکان.

ئەتانۆلۆل[55] پرۆپرانۆلۆل[56]. ئەم دەوایانە هەتا سەتا ٢٧مەترسیی سەکتەی دڵ دەهێننەخوارێ و لەو کەسانەی کە تووشی سەکتەی دڵ دەبن، ڕادەی مردن کەم دەکەنەوە.

**نەشتەرگەریی:**

نەشتەگەریی شێوەیکیترە بۆ دەرمانی ناتەواویی دڵ. جاروبار بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانی نەخۆشیی و باشترکردنی ڕەوتی خوێن لە نەشتەرگەریی "بایپەسی خوێنبەری کرۆنێریی"[57] یان ئانژیۆپلاستیی کەڵکوەردەگیرێ. ئەو کاتەی کە دڵ بە شێوەیەکی بەرچاو کارایی پۆمپاژکردنی خوێن لە دەست بدا، پێوەندی دڵ[58] دەتوانێ تەنیا ڕێگای پاراستنی ژیانی نەخۆش بێ. بەڵام جار وبار نەخۆش دەبێ بەمانگ و ساڵ چاوەڕێ وەدەست کەوتنی دڵێکی شیاو بێ.

51 Hydralazine
52 Diuretics
53 Furosemide
54 Digoxin
55 Atenolol
56 Propranolol
57 Coronary artery surgery bypass
58 Heart transplant

# نەخۆشیی دەربیجەکانی دڵ

لە سەرەتادا بۆ تێگەیشتنی باشتر لە نەخۆشیی دەربیجەکانی دڵ[59] باسی پێکهاتەی دڵ وکاری ئاسایی دەربیجەکان دەکرێ.







هەر وەکو لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد دڵ ئەندامێکی ماسولکەیە،٤ دیو و٤ دەربیجە[60] لەخۆی دەگرێ. دڵ بە هۆی دیواری نێوڕاستییەوە بە دوو بەشی راست و چەپ دابەش دەکرێ. لەهەر بەشدا دوو دیو و دوو دەربیجە دەبیندرێ. بە دیوەکانی سەرەوەی دڵ دالان و بە دیوەکانی خوارێ سکۆڵە دەڵێن. دەربیجەی سێ پەڕە[61] لە نێوان دوو دیوی

59 Heart Valve Disorders
60 Valve
61 Tricuspide valve

لای راستە. دەربیجەی میترال یان دووپەڕە[62] لە بەینی دوو دیوی لای چەپە. دوو دەربیجـەیتر لـە نێـوان دوو خوێنبـەری سـەرەکیی دڵ و دیوەکـانی سکۆڵەی چەپ و راستن. دەربیجەی سیپەلکیی[63] لە نێوان سکۆڵەی راست و خوێنبەری سیپەلکیی‌یە[64]. دەربیجەی ئائورت[65] لە نێوانی سکۆڵەی چەپ و شادەماری ئائۆرتە.

گرژبوونی دڵ دەبێتە هۆی چوونەسەرەوەی فشاری نێو سکۆڵەی راست و چەپ و کرانـەوەی دەربیجـەکانی سـیپەلکیی و ئـائورت و بەسـترانی دەربیجەکانی دووپەڕە و سێ‌پەڕە. پاش کرانەوەی ئەم دەربیجانە، خوێنی گەڕاوە بۆ بەشی راستی دڵ لە رێگای خوێنبەری سیپەلکیی‌یەوە دەگاتە سیی‌یەکان و خوێنی خاوێنی لای چەپی دڵ دەڕژێتە نێو شادەماری ئائورت و پاشـان بـە یـارمەتیی خوێنبـەرەکان رەوانەی ئەندامـەکان دەکـرێ، بـەم حاڵەتە"**سیستولە**"[66] دەکوترێ.

دوای خاوبوونەوەی دڵ، فشاری نێو سکۆڵەکان بە نیسبەتی فشاری نێو خوێنبەرەکانی سیپەلکیی و ئائورت دێتە خوارێ. ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی بەسترانی دەربیجەکانی سیپەلکیی وئائورت و بەرزبوونەوەی فشاری نێو دالانەکان. بەرز بوونەوەی فشاری نێو دالانەکان و هاتنە خوارەوەی فشاری نێو سکۆڵەکان دەبێتە هۆی کرانەوەی دەربیجەکانی دوو پەڕە و سێ پەڕە و رژانی خوێن لە دالانەکانەوە بۆ نێو سکۆڵەکان، بەم حاڵەتە "**دیاستولە**"[67] دەڵێن.

کاری سەرەکیی دەربیجەکانی دڵ رێگا دان بە رۆیینی خوێن لە نێو دڵ و یان بۆ دەرەوەی دڵ و تەنیا بەرەو شوێنێکە. شێوانی پێکهاتە و کاری

62 Mitral valve
63 Pulmonary valve
64 Pulmonary artery
65 Aortic valve
66 Systole
67Diastole

دەربیجـەکان دەبێتـە هـۆی بەسـران و تەنگبـوونی ڕێگـای ڕۆیینـی خـوێن و یاخود ئاوەڵابوونی دەربیجەکان وگەڕانەوەی خوێن.

لێرەدا بە کورتیی باسی بەشێک لـە نەخۆشـیی دەربیجـەکانی ئـائورت و دوو پەڕە دەکەین کە بە نیسبەتی نەخۆشیی دربیجەکانیتر زۆرتر دەبیندرێن.

### تەنگیی دەربیجەی ئائۆرت[68]

تەنگیی دەربیجەی ئائورت دەبێتە هۆی پێشگیریی لە ڕۆیینی ئاسایی خوێنی خاوێن لە ڕێگای ئائورتەوە بۆ ئەندامەکان. ئەندازەی ئاسایی




دەربیجـەی ئـائورت ٣ سـانتیمەتری چوارگۆشـەیە. نیشـانەکانی ئـەم نەخۆشییە کاتێک دەبیندرێ کە ئەندازەی دەربیجەی ئائورت بگاتە کەمتر لـە ١ سـانتیمەتری چوارگۆشـە. تەنگیی دەربیجـەی ئـائورت دەبێتـەی هـۆی چوونەسـەرەوەی فشـاری نێـو سـکۆڵەی چـەپ، ئەسـتووربوونی[69] ماسولکە و هێنانەخوارەوەی هێزی گرژبوونی دڵ.

---

68 Aortic Stenosis
69 Hypertrophy

**هۆیەکان:**

**کۆبوونـــەوە و نیشـــتنی کالســـیۆم لـــە ســـەر دەربیجـــەی ئـــائورت.** چوونەسـەرەوەی تەمـەن دەتـوانێ هـۆی کۆبوونـەوەی کالسـیۆمی خـوێن لـە سـەر دەربیجـەی ئـائورت بێ. لـە کەسـانێکدا کۆبوونـەوەی کالسـیۆم رەنگبێ ببێتـە هـۆی سـەختبوون(رەق بـوون) و تەنگیـی دەربیجـەی ئـائورت. ئـەم حاڵەتە بە تایبەتیی پاش تەمەنی ٦٠ساڵیی زۆرتر وەبەرچاو دەکەوێ، بەڵام سـەرەڕای ئـەوەش، وێدەچێ تـا تەمەنـی ٧٠ یـا ٨٠ سـاڵیی هـیچ نیشـانەیەکی تایبەتیی لە نەخۆشدا نەبیندرێ.

**تای رۆماتیسمیی:**

**هەوی چڵکیـی گـەرو بە هـۆی سـترێپتۆکۆکەوە** (چەشـنێک باکتریـا) بـە تایبەتیی لە کاتی منداڵیدا سـەرچاوەی ئەم نەخۆشـییەیە. ئـەم نەخۆشـییە دەبێتـــە هـــۆی پێکهـــاتنی جێـــی بـــرین[70] و تەنگیـــی دەربیجـــەی ئـــائورت و دربیجەکانی دیکەی دڵ.

**ئاڵۆزییەکانی تەواوکاریی زگماکیی دڵ.** منداڵگەلێک بە تەنگیی زگمـاکیی ئائورتەوە لە دایک دەبن. نیسبەتی ئەم حاڵەتە لە نێوان کوڕ و کچدا چوار بـە یەکە.

**نیشانەکان:**

سینگ ئێشە،

نێشانەکانی ناتەواویی دڵ،

70 Scar tissue

بورانەوە، (نەگەیشتنی خوێنی پێویست بۆ ماوەیەکی کورت بە مێشک، بە تایبەتیی لەکاتی چالاکیی فیزیکیی‌دا دەبێتە هۆی لە هۆشچوونی لەنەکاوی نەخۆش)،

ماندوویی و داکشانی هێز لەکاتی چالاکیی‌دا،

پشووسواریی بە تایبەتیی لەکاتی چالاکیی فیزیکیی‌دا،

دڵە کوتە،

ماسینی مەچەکی پێ و قاچەکان،

لەنەکاودا مردن.

**چارەسەریی:**

وەلانانی هەر چەشنە کار و چالاکیی قورس و دژواری فیزیکیی.

بە پێی رادەی تەنگیی دەربیجەی ئائورت و نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە لە دەوا یان نەشتەرگەریی و پێوەندی دەربیجەی ئائورت کەڵک وەردەگیرێ.

## گەڕاندنەوی ئائورتیی[71]




71Aortic Regurgitation

گرژبوونـــەوەی ســـکۆڵەی دڵ دەبێتـــەهۆی بـــەرزبوونەوی فشـــاری نێـــو سـکۆڵە، کرانــەوەی دەربیجــەی ئــائۆرت و نــاردنی خــوێن بـۆ دەرەوەی دڵ. ناتەواوبەســترانی دەربیجــەی ئــائۆرت لــە کــاتی خاوبوونــەوەی دڵــدا هــۆی گەڕانــەوەی بەشـێک لـەخوێنی شـادەماری ئـائۆرت بـۆ نێـو سـکۆڵەی چەپـە. هەراویی[٧٢] و ئەستووربوونی سکۆڵەی چـەپ بەرهـەمی ئـەم ئـاڵ وگۆڕەیـە. نەخۆشییە هەروەها وەک ناتەواویی دەربیجەی ئائۆرتیش پێناسە دەکرێ

**هۆیەکان:**

هەوی چڵکیی نێوپۆشی دڵ[٧٣]،

ڕوماتیسمیی دڵ،

زەبروێکەوتن کە ببێتە هۆی دڕانی دەربیجە،

نەخۆشییەکانی ریشەی ئائورت وەکو سیفلیسی ئائورت،

بەرزبوونی فشاری خوێن،

ئاڵۆزییەکانی تەواوکاریی زگماکیی دەربیجـەی ئـائورت . ئەو کاتـەی کە دەربیجەی ئائورت بەجێی ٣ پەڕە، ٢ پەڕەی [٧٤]هەیە.

**نیشانەکان:**

ئەم نەخۆشـییە سـاڵانی سـاڵ دەتـوانێ هـیچ نیشـانەیەکی نـەبێ ( بێجگـە لەو کەسانەی کـە هـەوی چڵکیـی نێوپۆشـی دڵ هـۆی نەخۆشـییانە). بـە پێـی پەرەســـەندنی ئەم نەخۆشــییە و شــێوانی کــاری دڵ نیشــانەکانی خــوارێ دەبیندرێ:

پشووسواریی لەکاتی چالاکیی و وەرزشدا،

---

72 Dilation
73 Infective endocarditis
74 Bicuspid aortic valve

بوورانەوە،

دڵ ئێشە،

نیشانەکانی ناتەواویی دڵ.

بەپێی نیشانە و رادەی شێوانی کاری دڵ بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییەیە لە دەوا یان نەشتەرگەریی و پێوەندی دەربیجەی ئائورت کەڵک وەردەگیرێ.

## تەنگیی دەربیجەی میترال[٧٥]

تەنگیی دەربیجەی دووپەڕە هۆی پێشگیریی لە رژانی خوێنی دالانی دڵ بۆ نێو سکۆڵەیە. ئەندازەی ئاسایی ئەم دەربیجەیە ٤ تا ٦سانتیمەتری چوارگۆشەیە. تەنگیی ئەم دەربیجەیە دەبێتە هۆی نەگەیشتنی خوێنی پێویست بۆ نێو سکۆڵەی چەپ، بەرزبوونی فشاری نێو دالانی چەپ، پۆنگخواردنەوەی سیپەلکیی[٧٦] و هێنانە خوارێی رادەی ناردنی خوێنی دڵ بۆ ئەندامەکان.




75 Mitral Stenosis
76 Pulmonary congestion

**هۆیەکان**

a) ڕوماتیسمی دڵ هۆی سەرەکیی تەنگیی دەربیجەی دوو پەڕەیە.

b) ئاڵۆزییەکانی تەواوکاریی زگماکیی دڵ. منداڵگەلێک بە تەنگیی زگماکیی دەربیجەی دوو پەڕە لە دایک دەبن و دەبێ نەشتەرگەریی بکرێن.

**نیشانەکان**

پشووسواریی،

هێرشی شەوانەی پشووسواریی[77]،

ماسینی کتوپڕی سییەکان،

خوێنڕشانەوە[78]. لەوەدەچێ ئاکامی بەرزبوونەوەی فشاری نێو سییەکان بێ.

**چارەسەریی**

بەپێی ڕادەی تەنگیی دەربیجەی دووپەڕە و سەرهەڵدانی نیشانەکان، بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەوا یا نەشتەرگەریی و پێوەندی دەربیجەی مەترال کەڵک وەردەگیرێ.

**گەڕاندنەوەی میترالیی[79]**

لە کاتی گرژبوونەوەی سکۆڵەدا، بەسترانی ناتەواوی دەربیجەی دووپەڕە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی خوێنی نێو سکۆڵە بۆ دالانی دڵ. ئەم ئاکارە دەبێتە هۆی هاتنەخواریی ڕادەی ڕۆیینی خوێن بۆ ئەندامەکان، بەرزبوونەوەی فشاری نێو دالان و سییەکان و لە ئاکامدا شێوانی کاری سکۆڵەی دڵ. ئەم حاڵەتە هەروەها وەک ناتەواویی دەربیجەی دووپەڕە پێناسە دەکرێ.

---

77 Paroxysmal nocturnal dyspnea

78 Hemoptysis

79 Mitral Regurgitation




**هۆیەکان:**

هەوی چڵکیی نێوپۆشی دڵ،

ڕوماتیسمی دڵ،

شێوانی کاری مەمە ماسولکە[80] وەک ئاکامی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ،

هەراویی سکۆڵەی چەپ،

کاردیۆمیوپاتیی هیپێرترۆفیک[81]. ئەستووربوونی ماسولکەی میۆکارد و دیواری نێوان دوو سکۆڵەی ڕاست و چەپ.

**نیشانەکان:**

ماندوویی و بی حاڵیی،

پشووسواریی،

ڕشانەوەی خوێن بەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری نێو سییەکان،

هێرشی شەوانەی پشووسواریی.

80 Papillary muscle
81 Hypertrophic cardiomyopathy

**چارەسەریی:**

بە پێی رادەی نیشانەکان و شێوانی کاری دڵ بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیی‌یە لە دەوا یان نەشتەرگەریی و پێوەندی دەربیجەی دووپەڕە کەڵک وەردەگیرێ.

# ئاریتمیی دڵ[82]





ئاریتمیی چەمکێکە بۆ ناساندنی ئەو حاڵەتانە کە دەبنە هۆی خێرا، خاو، یان ناڕێک لێدانی دڵ. بە خێرالێدانی نائاساییی دڵ، تاکیکاردیی[83] و بە خاو لێدانی نائاساییی دڵ، برادیکاردیی[84] دەکوترێ. تاکیکاردیی و برادیکاردیی دوو وشەی یونانین. Cardia بە مانای دڵ، tachy بە مانای خێرا وbrady بە مانای خاو یا سووکە. ڕێژەی لێدانی دڵ لە تاکیکاردییدا پتر لە١٠٠ کەڕەت و لەخاو لێدانی دڵ کەمتر لە٦٠ کەڕەت لە خولەکێکدایە. تاکیکاردیی و برادیکاریی بە پێی هۆ و شێوەی شێوانی لێدانی دڵ بە چەشنی جۆراوجۆر دابەش دەکرێن.

لە سەرەتادا بۆ تێگەیشتنی باشتر لە"ئاریتمیی" باسی میکانیزمی گرژبوونی دڵ دەکەین.

---

82 Arrhythmia
83 Tachycardia
84 Bradycardia

گرژبـوونی دڵ بەشـێوەیەکی هاوکـات و ڕێکوپێکـە[85]، هـەوەڵ دالآن و بەدوای ئـەودا سکۆڵە گـرژ دەبێ. هـۆی سـەرەکیی گرژبـوونی دڵ ڕەوتێکی ئەلیکتریکی‌یە[86] کە لـە گرێی سینوسیی[87] نێو ماسـولکەی دالآنـی دڵ بەرهـەم دێ. ڕەوتێکـی ئـەلکتریکیی لـە ڕێگـای ریشـاڵەکانەوە[88] کـە وەک کـابلێکی(کێبلێکی) ئەلیکتـریکین[89] ڕەوانەی گرێـی دالآن - سـکۆڵە دەکـرێ. ڕەوتێکی ئـەلکتریکیی لـەم گرێی‌یـەوە بـەرەو سـکۆڵە دەبێتـە هـۆی گرژبـوونی سکۆڵە، لێدانی دڵ و پۆمپاژی خوێن. ڕێژەی ئاسـایی لێدانی دڵ لـە نێـوان ٦٠ تا ١٠٠ کەڕەت لە خولەکێکدایە. ژمارەی لێدانی ڕۆژانـەی دڵ نزیک بەهـەزار جـارە و دڵ لـە ڕۆژێکـدا ٧٥٧١ لیتـر خـوێن پۆمپـاژ دەکـا. ڕادەی لێدانی دڵـی زۆربەی خەڵک لە کاتی پشوودان و وەرزشدا وەکـو یـەک نـی‌یە. ئـەم حاڵەتـە تا کاتێک نەبێتـە هـۆی چوونـەخوار یا بەرزبوونـەوەی فشـاری خـوێن، وەکـو حاڵەتێکی ئاسایی دەناسرێ.




ڕەوگەی ئەلیکتریکیی دڵ

---

85 Synchronize
86 Electric current
87 Sinus node
88 Fibers
89 Electrical Cable

**سەرچاوەی ناڕێک لێدانی دڵ** جۆراوجۆرن، وەکو:

ناتەواویی گرێی سینوسیی بۆ بەرهەمهێنانی رەوتی ئەلیکتریکیی پێویست،

نائاسایی بوونی ئەو ئاهەنگەی[90] کە لە گرێی سینوسیی‌دا بەرهەم دێ،

پسان یان بەسترانی تەزووی ئەلیکتریکیی (لێدانی سەربەخۆی دالان و سکۆڵە) بێ پێوەندیی لەگەڵ یەک و هتد ... .

**نیشانەکان:**

مرۆڤ لە کاتی ناڕێک لێدانی دڵ هەست بە نیشانەکانی خوارەوە لە سینگی‌دا دەکا :

دڵ رەپێ کردن[91]،

دڵە تەپێی سەخت[92]،

تەپ تەپ کردنی دڵ[93] ،

خێرا و رێک و پێک لێدانی دڵ[94] ،

هەروەها نەخۆش لە کاتی ناڕێک لێدانی توندی دڵدا تووشی سەرگێژیی، بێهۆشیی، سینگ ئێشە و پشووسواریی دەبێ.

**هۆیەکان:**

ئاریتمیی زگماکیی دڵ،

جگەرە، ئەلکۆڵ، کافئین، ماددەی سڕکەر،

هێرشی دڵ،

گەورەبوونی دڵ وەک ئاکامی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن،

پڕکاریی تیرۆئێد،

و هتد ... .

---

90 Rhythm
91 Palpitations
92 Pounding
93 Thumping
94 Fluttering

## چەشنەکانی ئاریتمیی دڵ:

بە نارێک لێدانیَ دالآنی دڵ، ئاتریال ئاریتمیی[95] و بە نارێک لێدانی دڵ کە لە سکۆڵەوە دەست پیَ دەکریَ - ویَنتریکل ئاریتمیی [96] دەکوتریَ. مەترسیی"نارێک لێدانی سکۆڵەی دڵ" بۆ مروڤ زۆرترە هەتا "نارێک لێدانی دالانی دڵ".

لە حالەتی سەختدا، ئاریتمیی دەتوانیَ هۆی هێنانەخوارەوەی فشاری خوێن و مردنی مرۆڤ وەک ئاکامی هاتنەخوارەوەی پۆمپاژی خوێن بیَ. ناتەواویی دڵ بۆ پومپاژی شیاوی خوێن دەتوانیَ ببێتە هۆی دەڵەمەی خوێنی نێو دیوەکانی دڵ. چوونی دەڵەمەی خۆێن بۆ مێشک دەبێتە هۆی جەڵتەی مێشک.

## دیارییکردن[97]

بۆ دیارییکردنی ئاریتمیی لە شێوەکانی خۆارەوە کەڵک وەردەگیریَ:

- گرتنی نەوار(هێلکار)ی دڵ[98]. بەم مەبەستە لە دەزگای ئەلێکترۆکاردیۆگراف[99] کەڵک وەردەگیریَ.
- گرتنی نەواری دڵ لە کاتی وەرزشدا.
- کۆنترۆڵی کاری دڵ، فشاری خوێن، شەکری خوێن، ریَژەی هۆرمۆنەکانی تیرۆئێدی خوێن.

---

95 Atrial arrythmias
96 Ventricular arrythmia
97 Diagnosis
98 Electrocardiogram-EKG
99 Electrocardiograph

**چارەسەریی:**

چارەسەرکردنی ئاریتمیی لە پێوەندیی لەگەڵ چەشنی ئاریتمیی و ڕادەی جیددی بوونی‌دایە. بەشێکی زۆر لە ئاریتمیی‌یەکان پێویستیان بەهیچ چەشنە دەرمانێک نی‌یە. جار و بار تەنیا وەلانانی کافئین (کۆکا کۆلا، پیپسی کۆلا، قاوە و هتد ... ) دەتوانێ ببێتە هۆی گەڕانەوەی ئاهەنگی(ڕیتمی لێدانی) دڵ بۆحاڵەتی ئاسایی خۆی. بە پێی هۆ و چەشنی ئاریتمیی بۆ چارەسەرکردنیان لە دەوای جۆربەجۆر، هەروەها چاندنی ترپە ڕێکخەر[100] بۆ بردنەسەرەوەی ڕێژەی لێدانی دڵ و دیفیبریلەیتێر[101] بۆ هینانەخوارەوەی خێرالێدانی دڵ کە بۆ ژیانی نەخۆش جێ مەترسیین، کەڵک وەردەگیرێ.

**پێشگیریی:**

بۆ چارەسەرکردنی دڵە تەپە، باشترین ڕێگا ڕاگرتنی پارێزە، بۆ ئەو مەبەستە خاڵەکانی خۆارەوە پێشنیار دەکرێ:

وەلانانی جگەرە،

چالاکیی فیزیکیی لە ژێر چاودێریی دوکتور،

خواردنی خواردەمەنی کەم چەوریی و پڕ لە فیبر( سەوزیی، میوە و هتد...)،

کۆنترۆڵی کۆلسترۆلی خوێن،

کۆنترۆڵی فشاری خوێن،

هێنانەخوارەوەی قورسایی جەستە،

وەرزشی بەردەوام،

کۆنترۆڵی شەکری خوێن،

دووری لە هەر چەشنە سترێسی ڕۆحیی.

---

100 Pacemaker
101 Defibrillator

# نەخۆشیی ماسولکەی دڵ[102]




دڵ ئەندامێکی ماسولکەیی نێو بە تاڵە کە لە نێو رکەی سنگ، لە نێوان هەر دوو سییەکاندا جێگیربووە. لە گەوراندا بەرزایی دڵ ١٢ سانت، پانایی ٨ تا ٩ سانت و ئەستووریی ٦ سانتیمەترە. قورسایی دڵی پیاوان لە نێوان ٢٨٠ تا ٣٤٠ گرەم و لە ژناندا لە نێوانی ٢٣٠ تا ٢٨٠ گرەم دایە. دیواری دڵ لە سێ چین درووست بووە:

ماسولکەی دڵ[103] (میوکاردیوم)

نێوپۆشی دڵ[104] ( ئێندۆکاردیوم)

ڕووپۆشی دڵ[105](ئیپیکاردیوم)

---

102 Cardiomyopathy
103 Myocardium
104 Endocardium
105 Epicardium

ماسولکەی دڵ لە نێوەڕاستی دووپەردەی نێوپۆشی دڵ و رووپۆشی دڵدایە. رووپۆشی دڵ چینی نێوەکی تویخێکی دوو چین بە نێوی دڵپۆشە[١٠٦] (پریکاردیوم). نزیک بە ٥٠ میلیلیتر شلەیدڵپۆش[١٠٧] پێشگیریی لە لێکخشانی دوو چینی ئەم تۆیخە دەکا.

کاردیۆمیوپاتیی نەخۆشیی ماسولکەی دڵە. وشەی *cardio* بەمانای دڵ، *myo* بە مانای ماسولکە و *pathy*بە مانای نەخۆشیییە. کاردیۆمیوپاتیی دەبێتە هۆی شێوانی کاری ماسولکەی دڵ و ناتەواویی دڵ بۆ پۆمپاژی خوێن. کاردیۆمیوپاتیی نەخۆشییەکی پڕمەترسییە، بەتایبەتیی کە لەزۆربەی کاتەکاندا دەستنیشان و دەرمان ناکرێ. کاردیۆمیوپاتیی لە نێو لاواندا زۆرتر دەبیندرێ. سێ چەشنی سەرەکیی نەخۆشیی ماسولکەی دڵ بریتین لە:

106 Pericardium
107 Pericardial fluid

### ١- كاردیۆمیوپاتیی والا [108]




لــەکاردیۆمیوپاتیی والادا، دڵ گــەورە و هــەر دوو ســکۆڵەکان تووشــی هەراویــی دەبــن، هەروەهــا هێــزی گرژبونــەوەی دڵ و پۆمپــاژی خــوێنیش کەمدەبێتەوە.

**سەرەکییترین هۆیەکان:**

نادیار  یان نەناسراو [109]،

بنەماڵەیی،

ئەلکۆلیبوون،

نەخۆشیی خوێنبەری کرۆنێریی دڵ ( کاردیۆمیوپاتیی پاش سەکتەی دڵ لە سەتا٥٠ تا ٩٠ی بوارەکاندا هۆی ناتەواویی دڵە)،

بەرزبوونی فشاری خوێن،

٣ مانگی ئاخری دووگیانی ژن یا ٦ مانگی دوای زایین،

خووگریی بەکۆکائێن و هرۆئین،

---

108 Dilated(congestive) Cardiomyopathy
109 Idiopathic

مـاددەی ژەهراویـی[110] وەکـو کوبالـت، فۆسـفۆڕ، کـاربۆن مۆنۆئۆکسـید، جیوە،

دابەزینی کالسیۆمی خوێن[111]،

پڕکاریی تیرۆئید.

دەواکـــــانی دژی ریترۆڤـــــایرۆس وەکـــــو Zidovudine، Didanosine و Zalcitabine .

نەخۆشیی قەند،

فنوتیازینـەکان[112] (گروپێـک لـەدەواکان کـە بـۆ دەرمـانی نەخۆشـیی‌یەکانی رۆحیی وەکو شیزۆفێرنی و هتد ... بەکار دەبردریّ)،

و هتد ...

**نیشانەکان**

پشووسواریی لەکاتی جەموجوڵدا،

هێرشی شەوانەی پشووسواریی،

ماندوویی و داکشانی هێز،

دڵەکوتە،

سنگ ئێشە،

ئاریتمیی لە کاتی پشوودانداد.

**چارەسەریی**

دەرمانی هۆیەکانی نەخۆشیی. بڕوانە هۆیەکانی ئەم نەخۆشیی‌یە.

پێوەنـدی دڵ[113] لـەو کەسـانەی کـە تەمـەنیان ژێـرەوی ٦٠ سـاڵە و دەوا کاریگەریی لە سەرئەوان نەماوە.

110 Toxins
111 Hypocalcemia
112 Phenothiazines

## ٢- کاردیۆمیوپاتیی هیپێرترۆفیک[١١٤]




لەم نەخۆشییەدا ئەستووریی ماسولکەی دڵ و دیواری نێوەڕاستی هەر دوو سکۆڵەکانی راست و چەپ دەبیندرێ. ئەستووربوونی دیواری نێوان سکۆڵەکان لە کاتی گرژبوونەوەی سکۆڵەی چەپدا دەبێتە هۆی تەنگبوونی ناوچەی ژێرئائورت کە ئاکامی نزیکبوونەوەی دەریچەی دووپەڕە بە دیواری نێوەڕاستی دڵە. ئەم حاڵەتە بە تایبەتیی لە کاتی وەرزشدا دەتوانێ بە شێوەیەکی لەناکاو ببێتە هۆی بەسترانی تەواوی رێگای رۆیشتنی خوێن و راوەستانی دڵ.

ئەم نەخۆشییە بە دوو فۆرم دەبیندرێ:

فۆرمی بنەماڵەیی. ئەم نەخۆشییە لە لاواندا دەبیندرێ،

فۆرمی سپۆرادیک[١١٥] (بڵاوە، جاروبار) ئەم حاڵەتە لە نەخۆشە بە تەمەنەکاندا دەبیندرێ.

هەرشتێک یا ئاکارێک کە ببێتە هۆی بە هێزکردنی رەوتی گرژبوونەوەی دڵ، تەنگیی رێگای رۆیشتنی خوێن زۆرتر دەکا. بۆ وێنە:

---

113 Heart transplant
114 Hypertrophic Cardiomyopathy
115 Sporadic

دەوا وەکو دۆپامین[116]، ئیپینئفرین[117]، نیترۆگلیسیرین، میزهێنەرەکان و ئەڵکۆل،

کەمبوونەوەی نائاسایی ئاویلکەی جەستە[118]،

خێرالێدانی دڵ،

لە سەرپێ راوەستان.

هەر شتێک یا ئاکارێک کە ببێتە هۆی خاوکردنەوەی رەوتی گرژبوونەوی دڵ، تەنگیی رێگای رۆیشتنی خوێن کەمتر دەکاتەوە. بۆ وێنە:

دەوا وەکو پرۆپرانۆلۆڵ، ویراپامیل،

زۆربوونی نائاسایی ئاویلکەی جەستە[119]،

خاولێدانی دڵ،

هەڵتروشکان.

**نیشانەکان:**

پشووسواریی،

لە هۆشچوون بۆ ماوەیەکی کورت بە تایبەتیی لەکاتی وەرزشدا،

سنگ ئێشە ( راکشان دەبێتە هوی کەمکردنەوەی ئێش)،

دڵە کوتە،

مردنی لەنەکاو دەتوانێ تەنیا نیشانەی ئەم نەخۆشیییە بێ (ئەم حاڵەتە بە تایبەتیی لە لاواندا لە کاتی وەرزشدا دەبیندرێ).

116 Dopamine
117 Epinephrine
118 Hypovolemia
119 Hypervolemia

**چارەسەرکردن:**

دەوا بۆ هێنانەخوارێی کار و پێویستیی دڵ بەئۆکسیژێن (پرۆپرانۆلۆل، ویراپامیل).

نەشتەرگەریی دڵ.




**٣- کاردیۆمیۆپاتی بەرتەسک**[١٢٠]

خوێنی نێو دالان لە کاتی خاوبوونەوەی دڵ دەڕژێتە نێو سکۆڵەکان. گرژمانەوەی سکۆڵە وەک ئاکامی رەقبوون و نەگۆڕیی ماسولکەی سکۆڵە دەبێتە هۆی پێشگیریی لە گەیشتنی خوێنی پێویست بە دیوەکان و گەڕانەوەی خوێن بۆ نێو سیستەمی سووڕانەوەی خوێن.

**هۆیەکان:**

نەخۆشیی ئەندامەکانیتر سەرچاوەی سەرەکیی ئەم نەخۆشییەن وەکو:

- **ئامیلۆئیدۆز**[١٢١]. یەکێک لە هۆیەکانی سەرەکیی ئەم چەشنە کاردیۆمیوپاتییەیە کە جاروبار لە پێوەندیی لەگەڵ شیرپەنجەکاندا دەبیندرێ (ئامیلۆئید – چەشنە پرۆتیینی روون کە بەرهەمی رزینی تانەکانی جەستە. ئامیلۆئیدۆز بە مانای نیشتن و کۆبوونەوەی ئامیلوئید لە

120 Restrictive Cardiomyopathy
121 Amyloidosis

ئەندامەکانە، کە دەبێتە هۆی رەق و ئەستوور بوون و شێوانی کاری ئاسـایی ئەندام)،

- **هێموکرۆماتۆز**[122]. لەم نەخۆشییەدا ئاسن بە شێوەیەکی نائاسـایی و لە رادەبەدەر لە ئەندامەکاندا کۆ دەبێتەوە،
- **سـارکۆئیدۆز**[123]. نەخۆشـییەکی درێژخایـەنی سیسـتماتیکە کـە هۆیەکانی جارێ نەناسراون. لە زۆربەی ئەندامەکانی جەستە گرێی زۆر ورد بە ئەندازەی شەکر یا خیز بەرهەم دێ کە پێیان گرانولۆم[124] دەکوترێ،
- **هێرشی دڵ** کە ببێتەهۆی پێکهاتنی جێبرین،
- **کـارتێکەریی ژەهراویـی ئانتراسـیکلین**[125] (لـەم دەوایـە بـۆ دەرمـانی شێرپەنجەی خوێن کەڵک وەردەگیرێ)،
- **نەخوشی قەند،**
- وهتد ... .

**نیشانەکان:**

ماسینی دەست و پێ،

ماندوویی و داکشانی هێز،

پشووسواریی لەکاتی وەرزشدا،

کۆبونەوەی نائاسایی ئاو لە نێو دیوەکانی جەستە،

ئاریتمیی دڵ.

---

122 Hemochromatosis
123 Sarcoidosis
124 Granulomas
125 Anthracycline

**چارەسەرکردن:**

دەرمانی ئەو نەخۆشییانەی کە سەرچاوەی کاردیۆمیوپاتیین،

بە پێ نەبوونی دەرمانی تایبەتی، تەنیا دەکرێ نیشانەکانی نەخۆشیی و ناتەواویی دڵ کۆنترۆڵ بکرێ (بڕوانە بەشی ناتەواویی دڵ)،

پێوەندی دڵ.

## هەوی ماسولکەی دڵ[126]

هەوی ماسولکەی دڵ دەتوانێ ببێتە هۆی خاڵەکانی خوارەوە:
والابوونی دیوەکانی دڵ و گەورەبوونی نائاسایی دڵ،[127]
ئازاری خانەکانی ماسولکەی دڵ،
ناتەواویی دڵ،
پێکهاتنی دەڵەمەی خوێن[128] لە دیواری دیوەکانی دڵدا،
جویَبوونەوەی دەڵەمەی خوێن و ڕێکەوتنی بۆ نێو سیستمی گەڕانی خوێن[129]هۆی سەکتەی دڵ و مێشک لەم نەخۆشانەدایە.

**هۆیەکان:**

هەوی چڵکیی ڤایرۆسیی (بە تایبەت کۆکساکی ڤایرۆسی B )، باکتریایی و ...،
یاوی ڕۆماتیسمیی،
کاریگەریی بەشێک لە دەواکان وەک : کۆکائین، سولفونامیدەکان[130]، ئیزونیازید[131]، تیتراسیکلین[132]، تریسیکلیک ئانتی دێپرێسانتەکان[133] و هتد
ماددەی ژەهراویی وەکو کاربۆن مۆنۆئۆکساید، ژەهری دیفتیری، ئارسینیک و هتد ...

126 Myocarditis
127 Cardiomegaly
128 Thrombosis
129 Thromboembolism
130 Sulfonamides
131 Isoniazide
132 Tetracycline
133 Trycyclic antidepressants

نەخۆشییەکانی سیستمیکی جەستە وەکو "هەوی رەگەکانی خوێن" [١٣٤]
و سارکۆئیدۆز.

**نیشانەکان:**
ماندوویی و داکشانی هێز،
ئێشی ماسولکە وجومگەکان،
یاو(تا)،
ئاریتمیی،
پشووسواریی (بە تایبەت لە کاتی وەرزشدا)،
بێهۆشبوون(دەتوانێ ئاکامی ئاریتمیی بێ)،
سنگ ئێشە، هەروها نیشانەکانی ناتەواویی دڵ.

***لەمنداڵاندا زۆرتر نیشانەکانی خوارەوە دەبیندرێ :***
***بەرز بوونەوەی تا،***
***بێ ئیشتیدایی،***
***شین و بۆر بوونەوەی رەنگی پێست.***
**چارەسەرکردن**
دەرمانی هۆیەکانی ئەم نەخۆشییە.
ئاستەنگیی جموجوڵی فیزیکیی جەستە (بۆ هینانە خوارەوەی کاری دڵ)،
دەرمانی ئاریتمیی،
دەرمانی ناتەواویی دڵ (بڕوانە بەشی ناتەواویی دڵ).

---

134 Vasculitis

## هەوی دڵپۆش[١٣٥]







دڵپۆش پەردەیەکی دوو چینە کە وەک توورەکەیەکی دڵ، گەورەدەمارەکانی "ئائورت" خوێنبەری سیپەلکیی و خوێنهێنەری کلۆرە دادەپۆشێ. نزیک بە٥٠ میلیلیتر شلەئاوی نێو دڵپۆش پێشگیریی لە لێکخشانی دوو چینی ئەم توێخە دەکا. زۆربوونی نائاسایی شلەئاوی ئەم توورەکەیە دەبێتە هۆی فشارهاوردن بە سنگ و پێشگیریی لە کاری دڵ.

**ئەرکی سەرەکیی دڵپۆش** بریتییە لە:

پێشگیریی لە جولانەوەی لە رادەبەدەری دڵ لە نێو رکەی سنگدا،

لە کاتی لەنەکاو پڕبوونی دڵ لە خوێن، پێشگیریی لە هەراویی لە رادەبەدەری دڵ دەکا،

هەروەها پێشگیریی لە خوشانی چڵکی سییەکان بە دڵ دەکا.

---

135 Pericarditis

**هۆیەکان:**

١. چڵکی ڤایرۆسیی وەکو ئکۆویروس[136] و کۆکساکی ویروس[137]،

٢. نەخۆشییەکانی سیستمیک وەکو نەخۆشییەکانی خۆپارێزیی، یاوی رۆماتیسمیی، سیل، شێرپەنجە، ناتەواویی گورچیلە،

٣. نەخۆشییەکانی دڵ وەکو هێرشی دڵ[138] و هەوی ماسولکەی دڵ،

٤. تیشک دەرمانیی[139] سنگ و کەڵک وەرگرتن لە ئەو دەوایانەی کە دەبنە هۆی کزیی سیستەمی بەرگریی جەستە،

٥. زەبرویێکەوتن بە هۆی ئازار و نەشتەرگەریی،

٦. نەناسراو،

٧. هەوی دڵپۆش زۆرتر لە نێو پیاوانی ٢٠هەتا ٥٠ ساڵە بە شوێن نەخۆشییەکانی چڵکیی سییەکان، و لە منداڵانیش بە شوێن نەخۆشیی ئادنوویروس[140] و کۆکساکی ویروس دەبیندرێ.

**نیشانەکان:**

سنگ ئێشە ئاکامی هەوی تان و پۆی پریکارد و لێکخشانی لەگەڵ دڵە. ئەم ئێشە لە کاتی دانیشتن و چەمانەوە بۆ پێشەوە کەم دەبێتەوە، بەڵام هەناسەکێشانی قوڵ و راکشان ئێش زۆرتر دەکا. ئێش بەرەو مل، دەفەی شان، زگ و پشت رادەکێشرێ،

هاتنەخوارەوەی رادەی وەدەرنانی خوێنی دڵ بەرەو ئەندامەکان دەبێتە هۆی داکشانی هێز، ماندویی، هاتنەخوارێی فشاری خوێن وخێراڵیدانی دڵ،

---

136 Echoviruses
137 Coxsackie viruses
138 Heart attack
139 Radiation therapy
140 Adenovirus

بەرزبوونەوی فشاری سیستمیکی خوێنهێنەرەکان دەبێتە هۆی گەورە بوونی جەرگ[141]، کۆبونەوەی نائاسایی و لە رادەبەدەری شلەئاو لەدیوەکانی جەستە، ماسینی لاق، مەچەکی پێ و زگ،

پۆنگخواردنەوەی خوێنهێنەری سیپەلکیی[142] بە تایبەتیی لە کاتی راکشاندا دەبێتە هۆی کۆخەی وشک و سەرهەڵدانی پشووسواریی،

یاو،

پەشێویی.

**چارەسەرکردن:**

دەرمانی هۆی نەخۆشییەکە،

ئازارشکێن،

دەوا بۆ دەرمانی هەوی پریکارد وەکو ئیبوپرۆڤین[143]، ئاسپیرین و جاروبار کۆرتیکۆسترۆئیدەکان[144]،



میزهێنەرەکان بۆ کەمکردنەوەی شلەئاوی لە رادەبەدەر و نائاسایی نێو توورەکەی دڵپۆش،

دەرکێشانی شلەئاو لە رێگای پریکاردیۆسێنتێز[145] – لەم حاڵەتەدا بە دوای رۆکردنی دەرزیەکی نێو خاڵیی یا کاتێتر، شلەئاوی نێو توورەکەی دڵپۆش خاڵی دەکریَ)،

---

141 Hepatomegaly
142 Pulmonary venous congestion
143 Ibuprofen
144 Corticosteroids
145 Pericardiocentesis

١) ئانتیبیۆتیک بۆ دەرمانی هەوی باکتریایی،

٢) نەشتەرگەریی لە کاتی درێژخایەنبوونی نەخۆشیی، ڕەقیی و ئەستووریی دڵپۆش. دەبێ ئەم تۆێخە لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە لە دڵ جویکرێتەوە[١٤٦].

**ئاڵۆزیی و مەترسیی:**

٣) ئاریتمیی،

٤) تامپۆنادی دڵ[١٤٧]. زۆربوونی لە ڕادەبەدەری شلەئاوی نێو توورەکەی دڵپۆش دەبێتە هۆی فشارهاوردن[١٤٨] بە دڵ،

٥) پریکاردیتیی بەرتەسک - هەوی توورەکەی دڵپۆش دەتوانێ ببێتەهۆی ڕەق و ئەستور بوونی دڵپۆش و نووسانی بە دڵ. ئەم حاڵەتە کە پێشگیریی لە گیربوونەوە و خاوبوونەوەی دڵ و پڕبوون و ناردنی خوێن دەکا، دەتوانێ یەکێک لە هۆیەکانی ناتەواویی دڵ بێ.

---

146 Pericardiectomy
147 Tamponade
148 Compression

# هەوی نێوپۆشی دل[149]




نێوپۆشی دڵ[150] توێخی نێو دڵە کە تەواوی ژووری دڵ، دەریچەکان و دیوەکانیی دادەپۆشێ. بە هەوی نێوپۆشی دڵ ئێندۆکاردیت دەکوترێ. دەربیجەکانی دڵ زۆرتر تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن. هەوی نێوپۆشی دڵ لە پێوەندیی لەگەڵ هۆیەکانی پێکهێنەریی بەدوو چەشنی چڵکیی (باکتریایی) و ناچڵکیی (یا خاوێن) دابەش دەکرێ. هەوی ناچڵکیی نێوپۆشی دڵ یا خاوێن بە نیسبەتی چەشنی چڵکیی کەمتر دەبیندرێ.

باکتریییەکان سەرچاوەی سەرەکیی هەوی نێوپۆشی دڵن. باکتریییەکانی گرووپی ستافیلۆکۆک[151]، ستریپتۆکۆک[152] و یا ئەو

149 Endocarditis
150 Endocardium
151 Staphylococcus

باكترییانەی کە لە حاڵەتی سروشتیی‌دا لە پێست و دەمی مروڤدا دەژین بە هۆی ئازار و برینداربوونی پێست، نەشتەرگەریی ددان و نێو دەم، جێی دەرزیی بە تایبەتیی لە خووگرەکان بەماددەی سڕکەر، ڕەوانەی خوێن دەبن و لە ڕێگای سیستەمی سووڕانی خوێن دەگەنە دەربیچەکانی دڵ و لەوێ جێگیر دەبن.

پەرەگرتوویی هەوی نێوپۆشی دڵ لە پێوندەیی لەگەڵ هێزی نەخۆشکەری باکتریایی و ئازاردیتنی تانی نێوپۆشی دڵ دەتوانێ توند و سەخت (هەوی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ[153]) یان سوک و بە مەترسیی کەمترەوە بێ (هەوی ژێرکتوپڕی نێو پۆشی دڵ [154]).




152 Streptococcus
153 Acute endocarditis
154 Subacute endocarditis

**هەوی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ:**

چەشــنی هێرشکەری(ئاگرەســیوی( باکتریــایی پێســت، بــە تایبــەتیی ستافیلۆکۆکەکان لـە ڕێگـای خوێنـەوە ڕەوانەی دڵ دەبـن وهێرش دەبنـە سـەر دەریچـەکانی سـاغی دڵ. ئـەم باکتریی‌یانـە پـاش زۆربوونیـان لـە نێـو دڵ، لـە ڕێگـای سیسـتمی سـووڕانی دڵ، لـە جەسـتەی مرۆڤـدا بـڵاو دەبنـەوە و دەبنـە هـۆی چڵکیی‌بـوونی ئەندامــەکانی‌تر، بەتایبــەتیی گورچیلــەکان، سـیی‌یەکان و مێشک. مەترسیی ئەم نەخۆشیی‌یە لە خووگرەکان کە بە شێوەیکی بەردەوام لە ڕێگای دەرزیی‌یەوە ماددەی سڕکەر بەکار دێنن زۆرتر لە خەڵکی دیکەیە. ئـەم نەخۆشـیی‌یە ئەگـەر دەرمـان نـەکرێ لەوەدەچـێ لـە مـاوەی چەنـد ڕۆژ تـا کەمتر لە ٦ حەوتوودا بە پێی پەرەگرتوویی نەخۆشیی‌یەکە، ببێتەهۆی مردن.

**هەوی ژێرکتوپڕی نێوپۆشی دڵ:**

گروپــی باکتریی‌یەکــانی ســترێپتۆکۆک وەکــو Streptococcus Sanguis، Mutans، Mitis، Milleri کـە لـە حاڵـەتی سروشـتیی‌دا لـە نێـو دەم و گەرودا دەژین، هۆی ئەم چەشنە نەخۆشیی‌یەن. ئەو دەربیجانەی دڵ کە پێشتر تووشـی ئـازاربوون، زۆرتـر تووشــی ئــەم نەخۆشـیی‌یە دەبـن. دەرمــان نــەکردنی ئــەم نەخۆشیی‌یە دەتوانێ هۆی مردنی نەخۆش لە ماوەی ٦ حەوتو تا ساڵێکدا بێ.

**لەم کەسانەدا مەترسیی هەوی نێوپۆشی دڵ بەرزترە:**

ئەوانــەی کــە تووشــی ئاڵۆزیی‌یــەکانی تەواوکــاریی زگمــاکیی دڵــن (وەک نەبەسترانی دیواری نێوان دو دالانی دڵ)،

ئازاردیتنی دەریچەکانی دڵ وەکو ئاکامی تا ڕۆماتیسمیی یان ئەستووریی دەریچەکان. کۆبوونـەوە و نیشـتنی کالسیۆم کـە بەرهـەمی چوونەسـەرەوەی تەمەنە، دەتوانێ هۆی ئەستووریی و ڕەق بوونی دەربیجەکان بێ،

دەریچەی دەستکرد و یا ماددەی بێگانە لە دڵ وەکو ترپەڕێکخەر،

به کارهێنانی ماددەی سڕکەر لە ڕێگای دەرزی لێدانەوە،
نەخۆشییە درێژخایەنەکان کە دەبنە هۆی کزیی سیستمی بەرگریی جەستە وەکو نەخۆشیی شەکر، ئەڵکولیبوون، شێرپەنچە وشیمی دەرمانیی، نەشتەرگەریی وەکو بڕین و دەرهێنانی ئاڵوو(لەوزەتین)[155].

**نیشانەکانی هەوی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ:**

بەرزبوونەوەی یاو،
سنگ ئێشە ،
پشوسوواریی،
کۆخە،
پچڕانی وردە ڕەگەکانی لەپی دەست و پێ،
لە کاتی سەخت بوونی ئازاری دڵ نەخۆش تووشی شۆک و بێهۆشی دەبێ.




155 Tonsillectomy

**نیشانەکانەی هەوی ژێرکتوپڕی نێوپۆشی دڵ:**

ئارەقەی شەوانە،

لەرز و تا،

یاو،

ئێشی ماسولکە وجومگە،

ماندوویی،

پشووسواریی،

سەرئێشە،

بێئیشتیدایی،

لەدەست دانی قورسایی جەستە،

بەرهەمهاتنی گرێی ورد و ئێشدار لە ژێر پێستی قامکەکانی لاق و دەست[156]،

پچڕانی وردە رەگەکانی چاو، مەلاژک، سنگ و قامکەکانی دەست وپێ.

**ئالۆزییەکان و مەترسیی:**

٨. ئاریتمیی،

٩. ناتەواویی دڵ،

١٠. سەکتەی دڵ،

١١. هەوی دڵپۆشی دڵ،

١٢. جویبوونەوەی دەڵەمەی خوێن لە دیواری رەگەکان و رۆیشتنی بۆمێشک، سییەکان و خوێنبەری کرۆنێریی دڵ کە دەبێتە هۆی سەکتەی دڵ و مێشک.

---

156 Osler nodes

**چارەسەریی:**

لە هەوی باکتریایی نێو پۆشی دڵ پێویستە بۆ ماوەی ٤ تا ٦ حەوتوو ئانتیبیۆتیک وەکو پینیسیلینەکان و سڤالۆسپرینەکان[157] بە نەخۆش بدرێ.

**لەحاڵەتەکانی خوارەوە پێویست بەنەشتەرگەریی دڵ هەیە:**

ئازاری دەریچەکانی ئائۆرت و دووپەڕە کە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی خوێن و ناتەواویی دڵ،

ناکۆکی کاری دەریچەکانی دڵ و بەردەوام مانی چڵک دوای تێپەڕینی ١٠ ڕۆژ لە دەرمان بە ئانتیبیۆتیکێکی شیاو،

زۆربوون و بە یەک نووسانی نائاسایی میکرۆبەکان کە دەبێتە هۆی بەرهەمهاتنی برین[158] لە سەر دەریچەی دڵ کە ئەندازەی پتر لە١٠ میلیمەتر بێ ( بڕوانە وێنەکانی خوارێ)،



ئەو کاتەی کە کارگەکان هۆی ئەم نەخۆشییە بن. کارگەکان وڵامی شیاو بەدەوا دەرمانی نادەنەوە.

---

157Cephalosporins
158Vegetation

## سەرچاوەکان:

### بەزمانی ئینگلیزیی:

Harrison's "Principals of Internal Medicine،15th edition

Cecil Essentials of Medicine٤،th edition

The Care of The Medical Patient٥،th edition.Fred F.Ferri،MD

Guide to Inpatient Medicine،Sanjay Saint،M.D.P.H& Craig Frances،M.D

Treatment Guidelines،2002 edition،Paul D.Chan،MD&Margaret T. Johnson،MD

Merck Manual of Medical information،Home edition،Robert،M.D Edittor-In-Chief

Emergency Medicine ٥th edition،David M.Cline and …

Your Heart،The American Medical Association،Home Medical Libery،Medical Editor Chales B.Claymann،MD

Cardiomyopathy ،texasheart.org

http://www.nlm.nih.gov

http://www.patient.co.uk

http://www.mayoclinic.org/

http://www.tmc.edu/thi/anatomy٢.html

http://heartdisease.about.com

http://www.americanheart.org

http://www.ehealthmd.com

http://www.intelihealth.com

.............

**بەزمانی ئاڵمانیایی:**

Praxisleitfaden Allgemainmedizin،3Auflage.Herausgeber:Prof.med.St.Gesenhaues.Ochtrup/Essen;Dr.med.R.Ziesche،Bad Essen

Innere Medizin،J.Scholmerich und …

Herzinfarkt (Myokardinfarkt) ،Prof. Dr. med. Michael Böhm ، Facharzt für Innere Medizin und Kardiologie ، http://www.netdoktor.de/krankheiten/fakta/herzinfarkt.htm

Herzinfarkt (Myokardinfarkt) ،Deutsches Medizin-Netz 1998-2004 http://www.medizin-netz.de

HEXAL MEMO MED،2.Auflage.Dr.med Sönke Müller

# کۆلسترۆڵ




کۆلسترۆل ماددەیەکی نەرم و چەورییدارە کە بە شێوەیەکی ئاسایی لە ئەندامەکانی مرۆڤدا بەرهەم دێ (سەتا٨٠ لە جەرگدا). کۆلسترۆل لەپێکهێنان و ساخکردنەوەی پەردەی خانەکان[١٥٩]، بەرهەم هێنانی هۆرمۆنەکانی ئیسترۆئیدی وەکوهۆرمۆنەکانی جنسیی ئسترۆژێن و تێستۆسترۆن، هەروەها ئەسیدی زیلک، رۆڵێکی سەرەکیی دەگێڕێ. ڕێژەی بەرهەم هاتنی رۆژانەی کۆلسترۆل لە جەستەی مرۆڤدا یەک گرەم و ڕێژەی پێداویستیی رۆژانەی جەستە ٣.٠ گرەمە. ئاستی ئاسایی کۆلسترۆلی خوێن ١٥٠ تا ٢٠٠میلیگرەم لە دیسیلیتردایە.

---

159 Cells

کۆلسترۆل بە تەنیا ناتوانێ لە نێو جەستەدا بگەڕێ و پێویستیی بە تێکەڵبوون لەگەڵ پرۆتێین و بەرهەم هێنانی "لیپۆپرۆتێین" هەیە. لیپۆپرۆتێین هەڵگر و گوێزەرەوەی کۆلسترۆلە. کۆلسترۆل و چەشنێکیتری چەوریی خوێن بە نێوی تریگلیسیرید لە ناوەندی لیپۆپرۆتێین جێگیر دەبن، و پرۆتێین و فۆسفۆلیپیدیش لە دەرەوە دایان دەپۆشن. بەرچاوترین لیپۆپرۆتێینەکانی جەستە بریتین لە:

لیپۆپرۆتێین بە چڕیی کەمەوە[١٦٠] و لیپۆپرۆتێین بە چڕیی زۆرەوە[١٦١]

جیاوازی لیپۆپرۆتێینەکان لە ڕێژەی کۆلسترۆل و تریگلیسیرید دایە. زۆربوونی رادەی لیپۆپرۆتێین بە چڕیی کەمەوە(LDL) لە خوێن و نیشتنی لە رەگەکاندا یەکێک لە هۆیەکانی سەرەکیی تەنگبوونی رەگەکانی کرۆنێریی دڵە. بەرزبوونەوەی رادەی LDLی خوێن(١٦٠ میلیگرەم و زۆرتر) نیشانەی بەرزبوونی مەترسیی نەخۆشییدڵ و رەگەکانە و وەک "کۆلسترۆلی خراپ" پێناسە دەکرێ. رادەی دڵخوازی LDLی خوێن ١٠٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردایە.

لیپۆپرۆتێین بە چڕیی زۆرەوە (HDL) هەڵگری سێ یەک و یا چوار یەکی کۆلسترۆلە و زۆربوونی ئەم چەشنە کۆلسترۆلە (پتر لە ٤٠ و بە تایبەتیی ٦٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا) مەترسیی نەخۆشیی دڵ ورەگەکان کەم دەکاتەوە و وەک "کۆلسترۆلی باش" پێناسە دەکرێ. لە HDL دا نیسبەتی رادەی پرۆتێینەکان پتر لە کۆلسترۆل و تریگلیسیریدە. HDL هۆی دەرکێشان و دوورکردنەوەی کۆلسترۆلی نێوخانەکان و دیواری رەگەکان و بردنی ئەوان بۆ نێو جەرگە. کۆلسترۆل لە جەرگدا دەبێتە ئەسیدی زیلک و

160 Low Density Lipoprotein LDL
161 High Density Lipoprotein- HDL

لە کیسەی زیلکدا ئەمباردەکرێ تا لە هاڕینی خواردەمەنییەکاندا بەشداری بکا.

تریگڵیسیرید چەشنیکی دیکەی چەورییە کە لە جەرگ و تانی چەوریدا بەرهەم دێ. رادەی دڵخوازی تریگڵیسیریدی خوێن ١٥٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردایە. لەو کەسانەی کە رادەی تریگڵیسیریدی خوێنیان بەرزە، لەوەدەچێ رادەی کۆلسترۆلی گشتیی و LDLی خوێنیان لە سەرەوە بێ و HDL – یان کەمتر لە رادەی ئاسایی بێ.




**رادەی جۆراوجۆری ئەم چەورییانە** بە پێی دەستەبەندی لیژنەی زانستی فێرکردنی نەتەوەیی کۆلسترۆلی ئەمریکا:

**لیپۆپرۆتیین بە چڕیی کەمەوە(LDL)**

| | |
|---|---|
| کەمتر لە ١٠٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | دڵخواز(ئاسایی) |
| ١٠٠ تا ١٢٩ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | نزیک بە دڵخواز |

| | |
|---|---|
| ١٣٠ تا ١٥٩ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | سەرەوەی سنوور |
| ١٦٠ تا ١٨٩ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | بەرز |
| ١٩٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | زۆر بەرز |

**کۆلسترۆلی گشتیی**

| | |
|---|---|
| کەمتر لە٢٠٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | باش |
| ٢٠٠ تا ٢٣٩ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | سەرەوەی سنوور |
| ٢٤٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا و پتر | بەرز |

**لیپۆپرۆتێین بە چڕیی زۆرەوە(HDL)**

| | |
|---|---|
| کەمتر لە٤٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | کەم |
| ٦٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا و پتر | بەرز |

**تریگلیسیرید**

| | |
|---|---|
| کەمتر لە١٥٠ میلیگرەم لە دیسیلیتردا | دڵخواز |

ئەم فاکتۆرانە رۆڵێکی بنەڕەتییان لە چوونەسەرەوەی کۆلسترۆلی خوێندا هەیە:

چالاک نەبوون،

قەڵەویی،

خواردنی رۆژانە: گۆشتی سوور، هێلکە، گۆشتی مریشک و کەڵەباب و چەوریی هۆی چوونەسەرەوەی کۆلسترۆلی خوێن،

جگەرەکێشان تا سەتا ١٥ رادەی کۆلسترۆلی باش دەهێنێتەخوارێ.

**نیشانەکانی چوونەسەرەوەی کۆلسترۆلی خوێن:**

له زۆربەی ئەو کەسانەی کە رادەی کۆلسترۆلی خوێنیان بەرزە، تا ئەو کاتەی کە ئەستور و رەقبوونی رەگەکانی کرۆنێریی دڵ نەبێتە هۆی تەنگ بوونیان، نیشانەیەکی تایبەتی نابیندرێ. تەنگبوونی رەگەکانی کرۆنێریی دڵ هۆی سەرەکیی سنگ ئیشە و شەپڵەی دڵە.

**شێوەی پێشگیریی لە بەرزبوونەوەی کۆلسترۆلی خوێن:**

لەبەرچاوگرتنی خاڵەکانی خوارەوە دەورێکی بەرچاویان لە هێنانەخوارەوەی کۆلسترۆلی خوێن هەیە.

١- **رژیمی خواردن**: تەواوی کۆلسترۆلی پێویستی مرۆڤ بە شێوەیەکی ئاسایی لە جەرگدا بەرهەم دێ و مروڤ پێویستی بە کۆلسترۆلی زۆرتر نییە لە رێی خواردنەوە. تەواوی چێشتەکانی حەیوانیی وەکو: گۆشتی سوور، زەردەی هێلکە، شیر، خامە، کەرە، چەوریی حەیوانیی، بەستەنیی، نارگیل، نێوک و رۆنی نارگیل، جەرگ، گورچیلە، سەروپێ، کۆلسترۆلیان هەیە. خواردەمەنییەکانی گیایی وەکو سەوزە، میوە، گوێز، پستە و دانەویڵە کۆلسترۆلیان نییە. رێکخراوی دڵی ئەمریکا پێشنیار دەکا رادەی خواردنی رۆژانەی کۆلسترۆل بۆ جەماوەری لەشساغ کەمتر لە ٣٠٠میلیگرەم و بۆ نەخۆشانی دڵ کەمتر لە٢٠٠ میلیگرەم بێ. چەوریی دەبێ تەنیا لە سەتا٣٠ی تەواوی چەوریی پێکبێنێ.

**بەرنامەی فێرکردنی نەتەوەیی کۆلسترۆلی ئەمریکا رژیمی خواردنی خۆارەوە پێشنیار دەکا:**

| | |
|---|---|
| چەوریی خەستکراو[162] | کەمتر لە سەتا ٧ی کالۆریی رۆژانە |
| چەوریــی خەســتنەکراوی یەک پێوەندیی[163] | نزیک بە سەتا ٢٠ی کالۆریی رۆژانە |
| چەوریی خەستنەکراو[164] | نزیک بە سەتا١٠ی کالۆریی رۆژانە |
| پرۆتێین | نزیک بە سەتا١٥ی کالۆریی رۆژانە |
| کەربۆهیدراتـەکان (مـاددەی قەندیی) | نزیک بە سەتا٥٠ی کالۆریی رۆژانە |
| سلۆلۆز | نزیک بە سەتا ٢٥ی کالۆریی رۆژانە |
| کۆلسترۆل | نزیک بە سەتا٢٠٠ی کالۆریی رۆژانە |

**بەپێی خاڵەکانی سەرەوە پێشنیار دەکرێ:**

٦) چێشتی کەمچەوریی بخۆن،

٧) لـە رۆنـی گیـایی و بـە تایبـەتیی رۆنـی زەیتـون و گەنمەشـامی کـەڵک وەرگرەن،

---

١٦٢ چەوریی خەست کراو، چەورییەکە کە هیچ چەشنە پێوەندییەکی سێ یا دوو لایەنەی نییە. ئەم چەشنە چەورییە لە چەوریی گۆشتی سوور، مریشک، ڕۆنی خورما و ڕۆنی نارگیلدا دەبیندرێ.

١٦٣ چەوریی خەست نەکراوی یەک پێوەندیی، چەورییەکە کە تەنیا پێوەندییەکی سێ یا دوو لایەنەی هەیە. ئەم چەشنە چەورییە لە ڕۆنی زەیتون، گوێز، کەلووز و ڕۆنی چواڵە تاڵە(بادامەتاڵە)دا دەبیندرێ.

١٦٤ لە چەوریی خەست نەکراوی چەند پێوەندییدا، دوو یا زۆرتر لە دوو پێوەندیی سێ یا دوو لایەنە دەبیندرێ. ئەم چەشنە چەورییە لـە ڕۆنـی گوڵەبەڕۆژە، سۆیا، گەنمەشامی، ڕۆنی کاژیرە، کونجی، ماسیی ئازاد، شاماسی، ماسی ئوزون برون و ساردیندا دەبیندرێ.

٨) کاتی چێشتلێنان چەوریی گۆشتی سوور و پێستی مریشک پاک کەنەوە،

٩) گوێز و پستە ڕۆڵێکی باشیان لە هێنانەخوارەوەی کۆلسترۆلی خراپدا هەیە،

١٠) لۆبیا (فاسۆلیا)، نۆک، سۆسکی برنج، لەتکەنۆک، جۆ و تەواوی دانەویڵەکان سەرچاوەیەکی باشی پرۆتیینن،

١١) چای ڕەش تا سەتا ٨ ڕادەی کۆلسترۆل دەهێنێتەخوارێ،

١٢) لە حەوتودا زۆرتر لە ٢ یان ٣ هێلکە مەخۆن،

١٣) گۆشتی ماسیی ئاوەکانی سارد وەکو ماسیی ئازاد، شاماسیی بخۆن، چەوریی ئۆمێگا ٣ی ئەو ماسییانە ڕۆڵێکی باش لە هێنانەخوارەوەی تریگلیسیریددا دەگێڕێ،

١٤) پرۆتیینی سۆیا ڕادەی کۆلسترۆلی باش دەباتە سەرێ و ڕادەی کۆلسترۆلی خراپ کەمدەکاتەوە،

١٥) یەکێک لە ڕێگاکانی هێنانەخوارەوەی تریگلیسیریدی خوێن، کەم خواردنی کەربۆهیدراتە.

٢ـ لەوەدەچێ وەرزش و چالاکیی بێپسانەوە هۆی چوونەسەرەوەی کۆلسترۆلی باش و هێنانەخوارێی مەترسیی نەخۆشیی دڵ وڕەگەکان بێ. پێویستە لە حەوتودا ٣ جار و هەر جار ٣٠ تا ٤٥ خولەک وەرزش بکرێ.



٣- دابەزاندنی قورسایی جەستە مەترسیی نەخۆشیی دڵ و ڕەگەکان کەمدەکاتەوە. قەڵەویی یەکێک لە هۆیەکانی چوونەسەرەوەی کۆلسترۆل، تریگلیسیرید و فشاری خوێنە.

٤- وەلانانی جگەرە دەبێتە هۆی هێنانەخوارەوەی کۆلسترۆلی خراپ.

٥- کۆنترۆلی شەکرەی خوێن.

٦- کۆنترولی فشاری رۆحیی.

٧- لەوەدەچێ خواردنەوەی یەک تا دوو پەیک ئەڵکۆڵ لە پیاوان و پەیکێک لە ژناندا ببێتە هۆی چوونەسەرەوەی کۆلسترۆلی باش و هێنانەخوارەوەی مەترسیی نەخۆشیی دڵ و ڕەگەکان.

٨- خواردنی حەب وەکو ستاتین لە ژێر چاودێریی دوکتور رۆڵێکی گرنگی لە هێنانەخوارەوەی کۆلسترۆلی خراپدا هەیە.

٩- کۆنترۆڵی کۆلسترۆلی خۆین پاش٢٠ ساڵەیی، هەر ٥ ساڵ کەڕەتێک، یەکێک لە ڕێگاکانی بەرگریی لە ئاکامەکانی چوونەسەرەوەی کۆلسترۆلە. پێزانین بە رادەیَ بەرزی کۆلسترۆل و هێنانەخوارەوەی تەنانەت لە سەتا ١ی کۆلسترۆل، مەترسیی نەخۆشیی دڵ و ڕەگەکان تا سەتا ٢ دەهێنێتەخوارێ.

## نەخۆشیی قەند(شەکرە)

بە نائاسایی چوونەسەرەوەی شەکرەی خوێن ( گلوکۆز[١٦٥])، نەخۆشیی شەکرە یان شەکرە دەکوترێ. رادەی ئاسایی شەکرەی خوێن بەیانیان و بە زگی بە تاڵ ٧٠ تا ١١٠ میلیگرەمە. شەکرەی خوێن پاش خواردن دەچێتە سەرێ و دوای دوو کاتژمێر دەگەڕێتەوە سەر رادەی ئاسایی خۆی. هۆرمۆنی ئینسۆلین[١٦٦] کە لە لووی شپیلکدا [١٦٧] بەرهەم دەێ، بەرپرسی راگرتن و پاڕاستنی رادەی ئاسایی شەکرەی خوێنە و چەندایەتیی راگوستنی گلوکۆز بۆ نێو خانەکان یان کۆکردنەوەی بۆ کاتی پێویست لە ژێر چاودێریی ئەو دایە. پاش نان خواردن چوونەسەرەوەی شەکرەی خوێن، کار دەکاتە سەر شپیلک تا ئینسۆلین بەرهەم بینێ و وردە وردە شەکرەی خوێن کەم کاتەوە. چۆن ماسولکەکان بۆ وزەی خۆیان لە گلوکۆز کەڵک وەردەگرن، رادەی گلوکۆز پاش جووڵان و چالاکیی فیزیکیی جەستە کەم دەکاتەوە. فشاری رۆحیی، نەخۆشییەکان(تەنانەت هەڵامەتیکی ساکار) و کەمکاریی گەدە کە بە هۆی بە تەواوەتی نەهاڕینێ خواردەمەنییەکانەوە یان مانەوەی چەند کاتژمێریان لەگەدەدا، دەبنە هۆی چوونەسەرەوەی شەکرەی خوێن.

**هۆو چەشنەکانی نەخۆشیی شەکرە:**

هەر وەکو باسکرا، نەخۆشیی شەکرە کاتێک سەرهەڵدەدا کە شپیلک نەتوانێ ئینسۆلین بەرهەم بێنێ یان خانەکانی جەستە بە ئینسولین وەڵام نەدەنەوە. هەر بۆیەش نەخۆشیی قەند بە دوو چەشنی بەستراوە(تیپی یەک)

---

165 Glucose
166 Insulin
167 Pancrea پانکراس ـ لوزالمعده

و نەبەستراوە(تیپی دوو) بە ئینسولین دابەش دەکرێ. زانایان لەسەر ئەو بڕوایەن، کە لە چەشنی یەک یا بەستراوە بە ئینسولیندا، هۆیەکانی ژینگە و لەوانەیە نەخۆشییە ڤیروسییەکان یان هۆیەکانی خواردن لە کاتی منداڵیی و گەنجێتیدا ببنە هۆکاری تێکچوون و خراپبوونی خانەکانی پێکهێنەری ئینسولین، پاش تێکدانی سیستێمی بەرگریی جەستە. وێدەچێ، بوونی بواری ژنیتیکیی لە پێکهێنانی ئەم چەشنەدا رۆڵێکی سەرەکیی هەبێ. ئەم چەشنە زۆرتر لە تەمەنی پێش ٣٠ساڵەییدا دەبیندرێ.




لەچەشنی نەبەستراوە بە ئینسولیندا، شپیلک بۆ قەرەبوویی ئەوەیکە خانەکانی جەستە وەڵامی ئینسولین نادەنەوە، دەست دەکا بە بەرهەم هێنانی هەرچی پتری ئینسولین. ئەم رەوتە ئەوەندە درێژە دەکێشێ تا شپیلک ئیتر ناتوانێ ئینسولین بەرهەم بێنێ. ئەم چەشنە شەکرەیە زۆرتر دەبیندرێ و

پاش تەمەنی ٣٠ ساڵیی سەرهەڵدەدا. قەڵەویی یەکێک لە هۆ سەرەکیی‌یەکانی ئەم نەخۆشیی‌یەیە. بە واتەیەک لە سەتا ٨٠ تا ٩٠ی نەخۆشەکان قەڵەون. ژن و پیاو وەک یەک تووشی ئەم نەخۆشیی‌یە دەبن.



**نیشانەکان:**

نیشانەکانی سەرەتایی ئەم نەخۆشیی‌یە بەهۆی چوونەسەرەوەی شەکرەی خوێنە. کاتێک شەکرەی خوێن دەچێتە سەرێ، یانی دەگاتە ١٦٠ و ١٨٠ میلی‌گرەم، گلوکۆز بە هۆی گۆرچیلەوە دەڕژێتە نێو میزەوە. گۆرچیلەکان بۆ تراوکردنەوەی میز ئاویکی زیاتر دەکەن بە میز. هەر بۆیەش یەکەم نیشانەی ئەم نەخۆشیی‌یە زیادبوونی میزە و بەو پێیەش تینوێتی زۆر بۆ قەرەبووی کەمبوونەوەی ئاو لە جەستەدا سەرهەڵدەدات. نەخۆش کز دەبێ و بۆ قەرەبووی ئەو کزیی‌یەتییە دەبێ زۆربخوا (زۆرخۆریی).

نیشانەکانی دیکەی ئەم نەخۆشیی‌یە بریتین لە:

١٦) پێش‌چاو ڕەش بوون،

١٧) خەواڵوویی،

١٨) دڵ تیکەڵاتن،

١٩) داکشانی هێزی جەستە لە کاتی هەڵسوڕان و چالاکیی‌دا.

لە دیابێتی چەشنی یەک یا بەستراوە بە ئینسۆلیندا، ئەم نیشانانە زۆر بەخێرایی سەرهەڵدەدەن، لەوانەیە نەخۆش تووشی هۆش لە خۆ چوون (کۆما) بێ. لەم حاڵەتەدا چۆن بە هۆی نەبوونی ئینسۆلین خانەکان ناتوانن بۆ وزەی خۆیان شەکرە بسوتێنن، پەنا دەبەنە چەوریی، ئەوەش وردە وردە نەخۆش بەرەو کۆما دەبا.

**ئاڵۆزییەکانی نەخۆشیی قەند:**

بە تێپەڕبوونی کات، زێدە شەکرەی خوێن کار دەکاتە سەر رەگ، دەمارەکان و ئەندامەکانی نێوەوەی جەستە. ئەستور و رەقبوونی رەگەکان (ئاتریۆسکلێرۆز) لەوانەدا کە تووشی نەخۆشیی شەکرە دەبن ٢تا ٤ جار پترە لە خەڵکی ئاسایی. تێکچوونی سیستمی گەڕانی خوێن دەبێتە هۆی زیان دیتنی دڵ، گۆرچیلە، مێشک و دڵ، کوێریی، لە کار کەوتنی گۆرچیلەکان، بێهەستبوون و لە کار کەوتنی دەست و پێ و چاک نەبۆونەوەی برینەکان.

**چارەسەریی:**




ئامانج لە دەرمانی ئەم نەخۆشییە، ئاسایی راگرتنی شەکرەی خوێنە. لە چەشنی بەستراوە بە ئینسۆلیندا، دەبێ بێوچان لە دەرزیی ئینسۆلین کەڵک وەرگیرێ. لە چەشنی نەبستراوەدا دەرمان بە شێوەی خواردنی حەب و

بەکارهێنانیی بە رادەی پێویست و بێ پسانەوەیە. لەوانەیدا کە حەب کاریگەریی نامێنێ، دەبێ ئینسۆلین بەکار بێ.

**چارەسەر بێ بەکارهێنانی دەوا:**

گۆڕانی شێوەی ژیان دەتوانێ رۆڵێکی بەرچاو لە پاراستنی ساغ و سەلامەتییدا بگێڕێ. بۆ ئەمەش، لە بەر چاوگرتنی ئەم شتانەی خوارەوە پێویستە:

خواردنی خواردەمەنیی پاک و تەندروست بە تایبەت میوە و سەوزە.

وەرزشی رۆژانە.

خۆکزکردن و کۆنترۆلی پەیتا پەیتای شەکرەی خوێن.

پاراستنی پاک و خاوێنی بە تایبەتیی خاوێنیی پێ و نێوان قامکەکان.

بۆپێشگریی لە خراپتربوونی نەخۆشییەکە، لەبەرچاوگرتنی رژیمێکی درووستی خواردن زۆر پێویستە.




خواردنی میوە و سەوزە هەموو رۆژێک، گۆشتی کەم چەوریی وەکو سنگی مریشک، گۆشتی ماسیی بە تایبەتیی کوڵاو یا برژاو، دانەویڵە وەک نیسک، نۆک و هتد....، خواردنی گوێز و پستە و هتد ... ، بەکارهێنانی رۆنی زەیتون، خواردنەوەی ٦ تا ٨ پەرداخ ئاو لە رۆژدا. وەلانانی جگەرە، نەخواردنی خواردەمەنیی قوتو(کۆنسێرڤکراو) و کەمخواردن بەڵام ٥ تا ٦ ژەم لە رۆژدا.

جووڵان و هەڵسووڕان بە تایبەتیی وەرزش دەتوانێ نەخشی لە کەمکردنەوەی شەکرەی خوێندا هەبێ. وەرزشی رۆژانە بە هۆی سووتانی گلوکۆز لە ماسولکەکاندا وەکو سەرچاوەی وزە، شەکرەی خوێن کەم

دەکاتەوە. هەروەها هەڵسووڕانی خوێن لە جەستەدا ڕێکوپێک دەکا و فشار و چەوریی خوێن کەم دەکاتەوە. وەرزش بۆ ماوەی ٢٠تا ٦٠ خولەک لە ڕۆژدا تەنانەت کاری دڵ و سیپەلک باشتر دەکا.

کۆنتڕۆڵی شەکرەی خوێن لە کاتەکانی دیاریکراوی ڕۆژدا، دەتوانێ لە پاراستنی سلامەتییدا نەخش بگیڕێ. بۆ وێنە ئەندازە گرتنی شەکرەی خوێن ٢ کاتژمێر پاش خواردن دەتوانێ نەخۆش تێبگەیەنێ کە بە کام خواردن، شەکرەی خوێن دەچێتە سەرێ.






هەروەها شەکرەی خوێن لە کاتژمێر ٢ یا ٣ی نیوە شەودا کەم و زیادیی گلوکۆزی خوێن بە درووستیی نیشان دەدا. ئەم کاتانەی خوارەوە بۆ ئەندازەگرتنی شەکرەی خوێن لەبارترن:

پێش نانی بەیانی یان ١ تا ٢ کاتژمێر پاشان.

پێش نانی نیوەڕۆ یان ١ تا ٢ کاتژمێر پاشان.

پێش نانی ئێوارە(شیو) یا ١ تا ٢ کاتژمێر پاشخواردن.

پێشخەوتن.

کاتژمێر ٢یان ٣ بەیانی.

**ڕادەی ئاسایی شەکرەی خوێن دەبێ لەو کاتانەی سەرەوەدا بەم شێوەیە بێ:**

پێش خواردن لە نێوان ٨٠ تا ١٢٠ میلیگرەمدا.
١ تا ٢کاتژمێر پاش خواردن کەمتر لە ١٨٠ میلیگرەم.
کاتی خەو لە نێوان ١٠٠ تا ١٤٠ میلیگرەمدا.

**هاتنەخوارێی شەکرەی خوێن:**

زۆرجار شەکرەی خوێن پاش بەکارهێنانی دەرزیی ئینسۆلین یان خواردنی زیادە لە پێویستی دەرمانی دژی شەکرە یا زۆر کەمخواردن یان هەر نەخواردن، وەرزشی زۆر، خواردنەوەی ئەڵکۆڵ بە سکی بە تاڵ، زۆر دادەبەزێ و ئەگەر چارەنەکرێ، نەخۆش بەرەو شەپلە، بێهۆشیی و تەنانەت مردن دەبا.

**نیشانەکانی کەمبوونی شەکرەی خوێن(کەمتر لە٦٠** میلیگرەم**) ئەمانەن:**

دڵەخورپێ،
ئارەقەکردن،
سەرئێشە،
هەست بە برسێتی کردن،
خێرالێدانی دڵ،
بێ هێزی ولەرزین.

پاش سەرهەڵدانی یەکێک لەم نیشانانە، نەخۆش دەبێ شتێکی شیرین بخوا و دوایی شەکرەی خوێنی ئەندازە بگرێ( پاش١٥خولەک) و ئەگەر قەندی خوێنی هەر نزم مایەوە، باشترە نان بخوات.

بێجگە لەو شتانەی باسکران، نەخۆشیی شەکرە لە سەر ژیانی جنسیی(سێکسی) و پێوەندیی ژن و مێردایەتی کاریگەریی هەیە. ئەو نەخۆشییە هەستی جنسی کەمدەکاتەوە و چوونەسەرەوەی شەکرە بواری

لــەبار بــۆ ســـەرهەڵدانی نەخۆشــیی‌یە میکرۆبیی‌یــەکان بــە تایبــەتیی لــە ئەندامەجنسیی‌یەکاندا دەڕەخسێنێ و ژیانی  جنس تووشی گرفت دەکا.

## سوود و زیانی جگەرەکێشان؟!




ئایا ئەو کەسانەی کە بە راستیی بە ئەوینی ژیان و ساغ و سلامەتیی خۆیان و ماڵ و خێزانیانەوە، سالانی ساڵە جگەرە دەکێشن، دەزانن کە چ کارێکی گەورە و بەنرخیان بەجێ گەیاندووە؟!

ئایا تا ئێستا سەرەڕای ئەو هەموو پڕوپاگەندە لاوازانەی کە بۆ وەلانانی جگەرە کراون، دەزانن ئەگەر جگەرە ولانێن یا کەمتری بکێشن، چ زیانێکی پڕ لە مەترسیی و ماڵوێرانکەری بەدواوەیە؟!

وەرن تەنیا بۆ ساتێک بیر لەو مەسەلە بکەینەوە کە بۆ وێنە تەنیا لە ئەمریکادا کە زیاتر لە سەتا ٣٠ی خەڵکەکەی جگەرەدەکێشن و هەر رۆژ سێ تا پێنج دۆلاری بو خەرج دەکەن، لە پڕدا، ئەو دڵە ناسکەیان بە حاڵی خۆیان و دەوروبەرەکەیان بسووتێ وبیانەوەێ جگەرە وەلانین یا کەمی کەنەوە، و ئەو کارە جێگاکانی دیکەی دونیاش بتەنێتەوە، چ دەقەومێ؟ ئایا ئەو کارە نابێتەهۆی کەم بوونەوەی بە میلیارد دۆلار قازانجی ئەو کۆمپانیانەی کە جگەرە دەفرۆشن؟ یان بێکاربوونی هەزاران کرێکار، کەم

بوونەوەی داهاتی دەوڵەت لەماڵیاتی(باج) فرۆشی جگەرە، کەم بوونەوەی کڕین و فروشتنی تووتن و ماڵ ویران‌بوونی تووتنکاران، هەروها کەمبوونەوەی داهاتی کۆمپانییەکانی ریکلام؟ لە لایەکی‌ترەوە ئەگەر یەکێک جگەرە نەکێشی و تووشی نەخۆشیی جۆراوجۆر نەبێ، ئەو هەموو مەتەبی(نۆرینگە) دوکتور و مێزی نەشتەرگەریی و قەرەوێڵەی خەستەخانانە چی لێدێ؟ لەگەڵ ئەمانەش، ئەگەر جگەرەکێشان خراپە، کەوابوو ئەو هەمو ریکلامە بۆ جگەرە بەتایبەتیی لە وڵاتانێک وەکو ئاڵمانیا، بەو تابلۆ رەنگاورەنگانە و بە وێنەی ژنانی جوان و پیاوانی وەرزشکار و بەخۆوە یان کاوبۆی جگەرە لە سەر لێو، کە لە ژێریان گاڵتەجاڕی وەزارتی تەندرووستی نووسراوە کە"جگەرە لەشساخیی دەخاتە مەترسیی‌یەوە"، بۆ چی‌یە؟

بەم شێوەیە دەبینین کە جگەرەکێشان چ خزمەتێکی گەورە بە داهاتی دەوڵەت، داهاتی کۆمپانیاکانی جگەرەفرۆشتن، ئاژانسە تەبلیغاتیی(ریکلام)یەکان، خەباتی دژی‌بێکاری کرێکارانی کۆمپانیی‌یە بەرهەمهێنەرەکانی جگەرە و تووتنکارەکان، پڕبوونی قەرەوێڵەی خستەخانەکان و (نۆرینگە)ی دوکتورەکان و تەنانەت کاری گۆڕهەڵکەنەکان دەکا!

ئێستا کە بڕیک لەسەر رۆڵی باشی جگەرەکێشان دواین، خراپ نی‌یە کەمێکێش باسی زیانەکانی جگەرەکێشان بکەین، ئەگەر چی زۆریش گرنگ نین !

### بۆ چی نابێ جگەرەبکێشرێ؟

ئەمڕو جگەرەکێشان گرنگترین هۆکاری نەخوشیی شێرپەنجە(سەرەتان)، زیادبوونی رادەی مەرگ و گرفتێگی گەورەی کۆمەڵایەتیی‌یە کە نە تەنیا سەلامەتیی جگەرەکێشەکان بەڵکو کەسانی جگەرە نەکێشش دەخاتە مەترسیی‌یەوە.

ریانەکانی دووکەڵی جگەرە هێندە وردن(بە ئەستووریی ٣/. میکرۆمیتر) کە بە ئاسانی هەڵدەمژرێن و لە تەواوی ڕێگاکانی بەرگریی هەناسەکێشان تێدەپەڕن و دەگەنە کیسەهەواییەکانی نێو سیپەلک. بەم شێوەیە، دووکەڵی جگەرە بە ئاسانی دێتە نێو سیپەلکی نە تەنیا جگەرەکێشانەوە، بەڵکو ئەوانەی کە جگەرەش ناکێشن و کاریگەریی خراپ دەکاتە سەر سەلامەتیی مرۆڤ.

"ئەندازیارانی ئاژانسی پاراستنی سروشت و ژینگە" پێشانیان داوە کە تەنانەت بەکەڵک وەرگرتن لە باشترین ئامرازەکانی پاڵاوتنی هەوا، وێچوونی نەخۆشیی شێرپەنجە لەو کەسانەدا کە جگەرە ناکێشن، بەڵام لەگەڵ جگەرەکێش دەژین، کەم نابێتەوە. هەر بۆیەش جیاکردنەوەی جگەرەکێش لەو کەسانەی کە جگەرەناکێشن لە کاتی جگەرەکێشاندا، پێویستە. زیانەکانی جگەرە، ژیان و کاری نزیک بە سەتا ٧٠ی خەڵکی جگەرەنەکێش دەخاتە مەترسییەوە.

جگەرەکێشان هۆی سەرەکیی زورێک لە نەخۆشییەکانی شێرپەنجە و بەرزبوونەوەی ڕادەی مردنە. بە پێی لێکدانەوەی ناوەندی "کۆنترۆڵ و بەرگریی لە نەخوشییەکان" تەنیا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ساڵانە٤٢٠ هەزار کەس بەهۆی جگەرەکێشانەوە دەمرن. زانیارییە دیمۆگرافییەکان پیشانیانداوە کە وێچوونی مردنی جگەرەکیشەکان پێش تەمەنی ٧٠ ساڵیدا، ٩ تا ١٠ قات زیاترە لەو کەسانەی کە جگەرە ناکێشن. بە پێی بەراوردی R.Peto لە ٥٠ ساڵی داهاتوودا، جگەرە دەبێتە هۆی مردنی ٤٥٠ میلیۆن کەس لە جیهاندا. کەمکردنەوەی جگەرە دەتوانێ تا سەتا ٥٠ مردنەکانی پێش وادەی ٢٠تا ٣٠میلیۆن کەس لە یەکەم چارەکی سەدەی ٢٠ و ١٥٠ میلیۆن کەس لە چارەکی دووهەمی سەدەی داهاتودا پێشگیریی بکا. ڕادەی مردنی ساڵانە بە هۆی جگەرەکێشانەوە چوار قات زیاترە لە سەرجەمی مردن بە هۆی پێکدادانی ئۆتۆمبێل و ١٢ قات زیاتر لە مردن بە

هۆی نەخۆشییەکانی "ناتەواویی ئیمەنیی" و زیاتر لە تەواوی تیاچوونەکان بەهۆی جەنگی سەربازیی ئەمریکاوە لە تەواوی سەدەی رابردوودا بووە.

ئەمڕۆ شێرپەنجەی سیپەلک، سەرەکیی‌ترین هۆی مردنە کە هەم لە ژنان و هەم لە پیاواندا دەبیندرێ. رادەی ئەم نەخوشییە لە ژناندا بە هۆی گۆڕانی عادەت لە جگەرەکێشاندا، بە توندیی بەرزدەبێتەوە. بۆ وێنە لە ٨٧ وڵاتدا کە ژنان جگەرە دەکێشن، ژنانی دانیمارکیی رکۆردیان بە دەستەوەیە و رادەی ژیانی ماوەیان[١٦٨] لە چاو وڵاتانی دیکەی ئەورووپادا زۆر لە خوارەوەیە. زۆربەی ژنانی دانیمارکیی بەهۆی شێرپەنجەی سیپەلک و نەخۆشییەکانی گیرانی سیپەلکەوە دەمرن.

ئەو لێکۆڵینەوە بەربڵاو و سرنجڕاکێشانەی کە بە تایبەتیی لە ئەمریکادا (ئەنجومەنی شێرپەنجەی ئەمریکا و هیرایاما) و سوید لەم بوارەدا کراون، هەموو بەو ئاکامە گەیشتوون کە لە وڵاتانێکدا کە زۆربەی خەلکەکەی هەمیشە جگەرەدەکێشن، شێرپەنجەی سیپەلک ١٠ تا ١٥ قات زیاترە لەو جێیانەی کە جگەرەکێشی نییە و ئەو سەرژمێریە لە نێو جگەرەکێشاندا تا ٤٠ قات زیاترە لەو کەسانەی کە بە حەیاتیان جگەرەیان نەکێشاوە.

لە بریتانیادا هۆی سەتا ٩٠ی شێرپەنجەی سیپەلک، جگەرەکێشانە. لە ساڵی ١٩٩٨ نزیکەی ١٧٨٠٠٠ شێرپەنجەی سیپەلک لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەراورد کراوە. ئەم نەخوشییە هۆی سەتا ٣٢ی مردنی پیاوان و سەتا ٢٥ی مردنی ژنان بووە. جگەرەکێشان هۆی سەرەکیی شێرپەنجەی سیپەلک لە پیاوان و ژنانی ئەمریکاییدایە.

زۆربەی مردنەکان بە هۆی جگەرەوە لە نەخوشەکانی دڵدا دەبیندرەی. لێکۆڵینەوەکانی Framingham پیشانییداوە کە رادەی نەخۆشییەکانی دڵ لە جگەرەکێشاندا لە سەتا ٦٥ و لە جگەرەنەکێشاندا سەتا ٢٣یە. لەو

168 Lifeexpectancy

کەسانەی کە نەخۆشیی کەم خوێنیی دڵیان هەیە، جگەرەکێشان مەترسییەکی گەورەیە، چون کە بە هۆی ئاکامەکانی نالەباری جگەرەکێشانەوە لە سەر رەوتی خوێنی کرۆنێریی، گەیاندنی ئۆکسیژێن بە ماسولکەکانی دڵ و مەترسیی دەڵەمەبوونی خوێن و رادەی مردن زۆر بەرزە. لە جگەرەکێشەکاندا، ئاستی نەخوشییەکانی دڵ ٦٠ قات زیاترە لەو کەسانەی کە جگەرەناکێشن. جگەرە بە هۆی بردنەسەرەوەی رادەی "کاربۆنمۆنۆکسیدی"خوێن و زیان بە ریگەکانی دڵ، وێچوونی گیرانی ئەو رەگانە بە هۆی دەڵەمەی خوێنەوە بەرزدەکاتەوە.

نیکۆتین و کاربۆنمۆنۆکسید دەبنە هۆی خێراڵێدانی دڵ، زێدە فشاری خوێن، هەروەها کەم گەیشتنی ئۆکسیژێن بەماسولکەکانی دڵ و زیان بەتوێخی ناوەکیی رەگەکان. هەروەها، لەبەرئەوەی کاربۆنمۆنۆکسید پەڕینەوەی چەوریی بۆ نێو رەگەکان زیاد دەکا، رادەی چەوریی (لیپید) لەخوێندا دەچێتە سەرێ.

پێوەندیی نێوان جگەرەکێشان و شێرپەنجەی نێو دەم، قورگ و مل، سەلماوە. هۆی سەرەکیی شێرپەنجەی لێو، ژەهرێکە کە لە توتندا هەیە. شێرپەنجەی گەرو، زمان، مل و قورگە پێوەندیی نزیکیان لەگەڵ بەکارهینانی توتن و ئەڵکۆڵەوە هەیە. ئەڵکۆڵ و توتن کارایی یەکتر بەهیزتردەکەن، بە شێوەیەک کە لە نەبوونی هەر کام لەوانە مەترسیی نەخۆشیی شێرپەنجە سێ لەسەر چوار کەم دەکاتەوە.

دەبی ئەوەش بزانین کە لە بریتانیا هۆی سەتا ٨٠ تا ٩٠ی شێرپەنجەی دەم و قورگ، جگەرەکێشانە. شێرپەنجەی لووی شپیلک (لوزالمعدە) لە جگەرەکێشاندا ٢ تا ٣ قات زیاترە لەو کەسانەی کە قەت جگەرەیان نەکێشاوە. زانیارییە "پەتا ناسییەکان" دەریان خستووە کە لە نێوان برین و ماسینی گەدە و دوازدەگرێ و جگەرەکێشاندا پێوەندیی نزیک و راستەوخۆهەیە. جگەرە ماوەی چاکبوونەوەی ئەو برینانە درێژتر و

هەڵدانــەوەیان کورتتردەکاتــەوە. هەروەهــا جگــەرە یــەکێک لــە ریســکەکانی ســەرهەڵدانی شــێرپەنجەی میزڵدانــە. ماددەکــانی نێــو دووکــەڵی جگــەرە بــە ڕێگــای خوێنــدا دەچنــە نێــو میــز و لــەوێوە دەگەنــە میزڵــدان. لــە بریتانیــا و باکووری ئەمریکادا جگەرە هۆی نیوەی شێرپەنجەکانی میزڵدانە.

جگەرەکێشان بۆ ژنی دووگیان(سکپڕ) دەبیتەهۆی گەورەنەبوونی منداڵ لە سک و زانی پێشوەخت، پچرانی هاوەڵ و مردنی مناڵەکە، بەرفرێدان و کـەمبوونی قورسـایی لەشـی منـاڵ پـاش لـە دایکبـوونی. مەترسـیی لـەنەکاو مردنی مناڵ دوای لە دایک بوون یا نەخۆشییەکانی سیپەلک لەو ژنانەیدا کە جگەرەکێشبوون، زۆر لە سەرەوەیە. لەو لێکۆڵینەوانەی کە لە Ontario کراون، دوو دەستە لە ژنان خرانە بەر لێکۆڵینەوە، دەستەی یەکەم ئەوانەی کە روژانە کەمتر لە پاکەتێک جگەرەدەکێشن و دەستەی دووهەم ئەوانەی کە زۆرتر لە پاکەتێک دەکێشن. مردنی مناڵ لە سکی دایکدا لە نێو دەستەی یەکەمدا لە سەتا٢٠ و لە نێو دەستەی دووهەمدا لە سەتا ٣٥ بووە.

هــەروەها لەلێکۆڵینەوەکانــدا دەرکــەوتوو کە مەترســیی نەخۆشــیی مننگۆکۆکیی[١٦٩] (چەشنێک میکرۆب کە بە تایبەتیی دەبیتە هۆی ماسینی پەردەکانی مێشک) لەو مندالانەیدا کە باوک و دایکیان جگەرەکێشن ٨ قات زیاتر لەو مناڵانەیە کە دایک و باوکیان جگەرە ناکێشن. ئایا بە لە بەرچاو گرتنی ئەو هەموو راستیی و فاکتانە دەکرێ و دەبێ درێژە بە جگەرەکێشان بدرێ؟

169 Meningoccal

**سەرچاوەکان:**


Obstetrics and Gynecology،Tamaral. 1998

Cigar Smoking and Death from coronary Heart Disease in a Prospective Study of US Men. ARSHINERN MED / VOL 159 ، NOV8 ،1999

-Effect of Smoking Cessation on Mortality After Myocardial Infarction.ARCHINTERN MED/VOL160 ،APR 10،2000

Increased mortality among Danish women: population based register study. BMJ volume 32 ،5 Aug.2000

Smoking in parents increases Meningococcal disease risk .BMJ vol.321 5 Aug.٢٠٠٠

Effectiveness of interventions to help people stop smoking : findings from the Cochran Library. BMJ Vol. 321 ، 5 Aug 2000

The Washington Manual 1995 .

Medicine . Allen R. Myers ،1997

فیزیۆلـۆژیی پزیشـکیی گـایتۆن، وەرگێـر: مەحەمـەد حەسـەنی ئـامری و... ، ١٣٧٢

دەرسنامەی پزیشکیی ئاکسفۆرد ١. تەرجومەی فارسیی. ١٣٦٨

نەشتەرگەریی شواتز، بەرگی ٤، تەرجومەی فارسیی ١٣٧٣ .

دەرســـنامەی پزیشـــکیي ئاکســـفۆرد ٢. نەخوشـــیىیەکانی دڵ و دەمـــار. تەرجومەی فارسیی ١٣٦٩.
نەخوشییە دەروونیی(هەناو)یەکان١ . دوکتور حجت اللەاکبرزادەپاشا ١٣٧٨.
نەخۆشیيیە دەروونیی(هەناو)یەکانی سیسیل، تەرجومەی فارسیی ١٣٦٩.
نەخۆشـیىیەکانی گەدە و ریخۆڵـە. پروفســور گونچاریـک (دەقـی روسـیی) مینسک ١٩٩٤.

## ئاكامە  کۆمەڵایەتی و پزیشکییەکانی
## زۆر خواردنەوەی ئەڵکۆڵ(کحول)



**"شەرابی ترێ، دیاریی خودایانی فریوخوراو بۆ زەوییە"**
***گیلگامێش پاڵەوانی بە نێو بانگی بابل***

خواردنەوەی ئەڵکۆڵ لە کۆنی کۆنەوە لە نێو تەواوی گەلانی گۆی زەوی باو بووە، تەنیا جیاوازیی مەسەلەکە لەوەدا بووە کە کەسانێک بە ئازادیی و کەسانێکیتر بە دزییەوە خواردویانەتەوە و بە پێی کولتور، ئایین و داب و نەریتی کومەڵگا خواردنەوەی شەراب، ئابجۆ(بیرە) و یا لیکۆر باو بووە.

لە نێوان بەشێک لە ئایینەکاندا خواردنی شەراب جێگای تایبەتی هەیە. بۆ مەسیحییەکان شەراب نیشانەی خوێنی عیسایە و بۆ جولەکەکانیش خواردنی شەراب لە زۆربەی کۆبوونەوە ئایینیەکاندا فەرز و واجبە. لە

ئیسـلامیش‌دا خواردنـەوەی شـەراب لـە سـەرەتادا حـەڵاڵ بـووە. پـاش سـەرکەوتنی سـوپای ئیسـلام لـە یـەکێک لـە شـەڕەکاندا کـە بـووە هـۆی شـڕەخۆریی و خـواردنەوەی لـە رادەبـەدری شـەراب، سـوپای ئیسـلام لـە کاتێکدا کە تەواو سەرخۆش دەبن دەکەونە بەرهێرشی کوت و پڕی سـوپای دوژمن و تێک دەشکێن. پاش ئەوە سەرانی ئیسلام لە رەوتێکدا خواردنەوەی شـەراب مەکـروە دەدەنـە قەڵـەم و دواتـر حـەرام دەکـرێ. لـە قورئـان کتێبـی ئاییـنیی موسڵمانانـدا بەردەوام باس لە خواردنەوەی شەرابی تەهور(بێ گەرد) لـە بەهەشـت دەکـرێ کـە نابێتـە هـۆی سـەرخۆشـیی، لەئەنجامـدا شـەڕابخۆر تووشی سـەرئێشـە، وڕێنەکـردن و گوناه کردن نابێ. لـە قورئانـدا بـەم چەشـنە ئاماژەی پێ دەکرێ:

"ئەو بەهەشتەی خودا بە پارێزگارانی بەڵێن داوە، چۆن چۆنییـە؟ چەنـدین روباری وای تێدا، ئاوەکەیان شلۆی نابێ، چەند روباری شیری تێدا، هەرگیـز تامی نەگۆڕاوە. چەندین روباری شەڕابی پێدا دەڕوا، تـا وەیخـۆن کـەیفی پـێ دەکەن. چەند روباریش لە هەنگڤی (هەنگوین) پاڵافتەهەن".

سورەتی موحەممەد ئایەی ١٥

(وەرگێڕ بۆ کوردی: هەژارموکریانی)

بـۆ پارێزگـارانیش جێگـەی بـە ئـاوات گەیشـتن هەیـە: باغسـتان و رێـزی رەزان. پۆلە کیژی مەمک خڕی هاوتەمەنیش. پیاڵەی پڕیش...

سورەتی نەبەئایەی ٣١_٣٤

(وەرگێڕ بۆ کوردی: هەژارموکریانی)

لـە سـورەتەکانی"ئەلواقیعە، ئەلسـافات، ئـەلتور و ئەلئینسـاندا بـەڵێنی خـواردنەوەی شـەروای بەهەشـتیی بـە بەنـدەکانی دوورەپـەرێزی خوداوەنـد دراوە، هەروەها لە سوڕەتی یوسف، ئایاتی ٣٦ و٤١ خـەونی بەندکراوێک بـە

کوشینی ترێ بۆ وەرگرتنی شەراو لەگەڵ ئازادیی ئەو کەسە لە بەندیخانە و نـەجات پەیـداکردنی لـە مـەرگ وێچنـداروە. بـەڵام لـە سـورەتەکانی ئەلحـەج، ئەلبەقەرە ئەلمائیدە داوا لە خەڵک دەکرێ کە دووریی بکەن لە خواردنـەوەی شـەراو کـە ئاکـارێکی چەپـەڵ و ئەهریمەنانەیـە و دەبێتـە هـۆی دوژمنیـی و نیفرەت و دوورخستنەوە لە یادی خوداوند و نوێژخوێندن.



لە هەر حاڵدا هـەزاران سـاڵە کـە ئەلکۆل (مەشروبات) وەک ئـاوی حـەیات[١٧٠] ناسـراوە. ئەڵکـۆل لـە کـاتی شـادیی و خۆشـیی وەک شـایی و زەماوەنـد، لـە دایکبوونی منداڵ، سـەری سـاڵی نـوێ میـوانیی و کۆبونـەوە لەگـەڵ دۆسـتان و هاوڕێیـان دەخورێتـەوە. خواردنـەوەی ئەڵکـۆل بـەوەش دوایی نایە، بـەڵکو لـە کـاتی پـەژارە و ناڕەحـەتییدا وەک سەرەخوشیی و لـە کاتی رووخـانی هیـوا و ئارەزووەکـان، گیـرو گرفتـی نێومـاڵ و تـەلاقوەرگرتن، دووری لـە وڵات و خـەم داربـوون نـۆش دەکـرێ و بـە چەشـنێک شـوێنی تایبـەتیی لـە ژیـان و کولتـوری گـەل و کومەڵدا پەیـدا دەکـات، هـەر لـە بـەر ئەمەیە کە شوێنکاری مەی لـە زۆربـەی شـێعرەکانی شـاعیران وەک: خـەیام،

170 Aqua vitae

بابا تاهیر، حافیز و به تایبەت شاعیری دڵ تەڕ و جوانی پەرستی کورد "هێمن" رەنگی تایبەتیی دەداتەوە، ئەوەش لە ناڵەی جودایی‌دا بەو پەڕی جوانیی دەگا:

**ساقیا وابادەوە، وابادەوە**
**روو لە لای من کە بە جامی بادەوە**
**موشتەری وەک من لە مەیخانی کەمن**
**زۆربەیان  شاد و بە کەیف وبێ خەمن**
**مەی حەرامە بۆ سەهەندە و بێ خەمان**
**مەستی بێ خەم بۆچی بگرن ئیخەمان**
**ئەم شەرابە تاڵە دەرمانی خەمە**
**لێی حەرام بێ ئەو کەسەی دەردی کەمە...**

*************

**بمشۆن بەشەڕاب کاتێ کە مردم**
**تەڵقینی بەمەی دەن رۆحیی سەردم**
**ڕۆژی پەسلان کە گەڕان وەم بێنن**
**خۆڵی دەری مەیخانەیە هەردم**

خەیام (وەرگێڕ بۆ کوردی: ح. ئەیوبزادە)

*************

**من و حاشا لە شەڕاب کەی وایە**
**ئاوەزم گاڵتە دەکا بەو رایە**
**تا بە ئاخرونی رێی مەیکدە بووم**
**بۆیە من نێونیشانم پەڕی بەر بایە**

حافیز (وەرگێڕ بۆ کوردی: ح. ئەیوبزادە)

*************

**روو لە گوڵزار بکەم بادە بە دەست**
**سەوزە بێ کانییەک و من سەر بەست**
**دوو سێ دەفران کە لە مەی شادم کەن**
**دەمڕفێنێ تا ئەلەست چاوی مەست**
بابا تاهیر عوریان (وەرگێڕ بۆ کوردی: ح. ئەیوبزادە)

سەبارەت بە مێژووی دۆزینەوە و ناسینی ئەلکۆل، کەس بە باشی نازانێ لە چ شوێنێکدا و لە چ کاتیکدا بۆ ئەوەڵ جار ئەلکۆل ئاشکراکراوە، بەڵام شوێنەوارناسەکان نوسخەی درووستکردنی ئابجۆ و پاشماوەی ئابجۆیان لە کووپەی سواڵەتدا لە ئێران و مێزۆپۆتامیا دۆزیوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٣٥٠٠ ـ ٥٤٠٠ پێش زایین. بە باوەڕی زۆربەی مێژووناسان ناوچەکانی رۆژ هەڵاتی نێوەڕاست و میزۆپۆتامیا ناوەندی سەرەکیی ناسین و دیتنەوەی ئەلکۆل بووە کە بە شێوەی هەڵکەوت دۆزراوەتەوە. بەتایبەت ٤٠٠٠ تا ٦٠٠٠ ساڵ پێش زایین لە ناوچەی نێوان دەریای رەش و خەزەردا، واتە ئەرمەنیستانی ئەمڕۆ، بۆ وەدستهێنانی شەڕاب کشتوکاڵی ترێ کراوە.

چیرۆک و ئەفسانەش سەبارت بەم مەسەلەیە کەم نییە. بۆ وێنە باس دەکرێ کە ٥ هەزار ساڵ لەمەوپێش، لە کاتی پاشایەتی جەمشید شادا، بۆ هەوەڵ جار شەڕاب بە شێوەیەکی هەڵکەوت لە ئێراندا درووست کراوە. بە پیی ئەم ئەفسانەیە، جەمشید شا زۆری حەز لە خواردنی ترێ بووە. رۆژێک لە رۆژان داوا لە پاکارەکانی دەکا تا ترێیەکی زۆری بۆ لە کووپەدا ئەمباربکەن تا هەر کاتێک ئەمری کرد ترێی بۆ بێنن. پاش چەند مانگێک شا ئاگادار دەکەن کە ترێی نێو کووپەکان بوونەتە خوشاوێکی لیێل. هەر لەم کاتەدا یەکێک لە ژنانی حەرەم کە ساڵانی ساڵ لە دەستی سەر ئێشەیەکی بەردەوام وەڕەز بووە، بەو ئاکامە دەگا کە دەبێ خۆی بکوژێ. ئەم خاتونە بە دیتنی ئەو کووپانە کە نیشانەی ژەهراوییبونیان بە سەرەوە بووە،

دەست دەکا بە خواردنەوەی ئەم ژەهرە خۆشە و بەجێی مردن سەر خۆش و مەست دەبێ و سەرئێشەکەشی کۆتایی پێدێ. ئەم ژنە خەبەری دەست کەوتەکەی بۆ شا دەبا، جەمشید شای ئیرانیش دوای خواردنەوەی شەرابەکە نێوی"پزیشکیی شاهنشایی" لە سەر دادەنێ.

یۆنانییەکانیش ٧٠٠ ساڵ پێش زایین شەڕابیان لە ترێ وەدەست هێناوە، چینییەکانیش بە تێکەڵاوکردنی برنج و هەرزن ئابجۆیان درووست کردووە و نێوی کیویان[١٧١] لە سەر ناوە. خۆاردنی ئابجۆ چوار هەزار ساڵ لەوە پێش لە میسریشدا باو بووە و فەقیر و دەوڵەمەند ئابجۆیان خۆاردۆتەوە. هەر لەم کاتەشدا نووسەرانی میسریی باسی کارتێکردنی خراپی ئابجۆ و شەڕابیان لەسەر بیر و جەستەی مرۆڤ هێناوەتە سەر کاغەز. لە شاری کۆن و بە نێوبانگی بابلیشدا کە ئیستا لە نێوەڕاستی عیراقی ئەمڕۆدایە ٤٠٠٠ هەزار ساڵ لەمەوپێش، خۆاردنی شەڕاب لەبەر کاریگەریی خراپی لە نێو کۆمەڵگادا قەدەغە کراوە.

## چەشنەکانی مەشروباتی ئەڵکۆڵیی و شێوەی سازکردنیان:

مەشروباتی ئەڵکۆڵیی بە پێی شێوەی وەدەست هێنانیان بە ٣ دەستەی ئابجۆ، شەڕاب و لیکۆر ( ڤۆدکا، ویسکیی، جین، براندیی و هتد....) دابەش دەکرێن. ئابجۆ و شەڕاب لە ڕێگای هەوێنبوون یان ترشان [١٧٢] و لە ڕێگای دڵۆپاندنەوە[١٧٣] درووست دەکرێن. لە ڕەوتی ترشاندا، کارگ[١٧٤] دەبێتە هۆی گۆڕانی شەکرەی نێو دانەوێڵە، میوە و بەشێک لە سەوزییەکان بەئەڵکۆڵ و کەربۆن دیئۆکسید.

---

171 Kio
172 Fermentation
173 Distillation
174 Yeast spors

زۆربەی گەلانی دونیا بە پێی کشت و کاڵی ناوچەکەیان لە یەکێک لە شتەکانی نێوبراو کەڵک وەردەگرەن، بۆ وێنە لە چین لە هەرزن و برینج، لە ئەفریقا لە مۆز، هەنگوین، گەنمەشانی و هەرزن؛ و لە ئەمریکای باکوردا سوورپێستەکان لە کاکتوس. لە یۆنان، گورجستان، ئەرمەنستان و کۆماری ئازەربایجان و زۆربەی وڵاتانیتر بۆ دروستکردنی شەڕاب لە ترێ کەڵک وەردەگیرێ.

لە رەوتی دڵۆپاندندا دوای کوڵاندنی دانەوێڵە و میوەی هەوینکراو هەڵمی پێکهاتو سارد دەکرێ و خۆشاوێک وەدەست دێ کە لیکۆری پێدەڵێن. بۆ دروستکردنی لیکۆرەکانیش بۆ وێنە لە روسیا لە پەتاتە، جۆ و گەنم؛ لە چین لە برنج؛ لە مەکسیک لە کاکتوس کەڵک وەردەگیرێ.

ئەندازەی ئەڵکۆڵی تەواوی مەشروبەکان بێ لە بەرچاوگرتنی چەشنی ئەوان بە یەک ئەندازەیە، تەنیا جیاوازیان لە ئەندازەی ئاوی تێکەڵاوکراوە. بۆ وێنە ئەندازەی ئەڵکۆڵی:

١٢ ئۆنس[١٧٥] ئابجۆ = ٥ ئۆنس شەڕاب = ١ و چوار یەکی لیکۆرە

**(یەک ئۆنس =٣٤. ٢٨گەرم)**

مەشروباتی ئەڵکۆڵیی، شەکرە وکالۆرییەکی زۆریان هەیە و لەوانەی کە بە وێنەیەکی بەردەوام دەیخۆنەوە، دەتوانێ ببیتە هۆی چوونەسەرەوەی قورسایی جەستەییان. بۆ وێنە:

١٢ ئونس ئابجۆ ١٧٠ کالۆریی، ٥ ئونس شەڕاب ١٥٠ کالۆریی و لیکۆری تێکەڵاوکراو لەگەڵ خۆشاوی میوەکان پتر لە٣٠٠ کالۆریی هەیە.

---

175 Ounce

**گرت و دەرکردنی ئەڵکۆڵ لە جەستە:**

لە سەتا ٢٠ی ئەڵکۆڵ لە گەدە و لەسەتا ٧٥ی ئەڵکۆڵ لە ریخۆڵە باریکەدا دەچێتە نێو خوێنەوە. لە سەتا٥ی ئەڵکۆڵ بێ هیچ گۆڕانێک لەگەڵ میزی مرۆڤ لە جەستە دەردەچێ. ئەڵکۆڵ لە رێگای خوێنەوە دەگاتە مێشک و ئەندامەکانی دیکەی جەستە و هەر بە پێی گەیشتنی بە مێشک، دەبیتە هۆی خاوبوونەوەی ئیشی مێشک و دەمارەکان و پیاو دەکەوێتە ژیرکارتێکردنی ئەڵکۆڵەوە. ئەڵکۆڵ رۆڵی ژەهری بۆ ئەندامەکان هەیە و هەر لەبەر ئەوەش جەستە حەوڵی خۆی دەدا تا هەر چی زووترئەم ژەهرە وەدەرنێ. هەر لەبەر ئەوەیە، کە رۆیینی خوێن، فشاری خوێن و کاری دڵ دەچێتە سەرێ. جەستەی مرۆڤ پێویستی بە کاتژمێریکە تا بتوانێ دوو یەک تا سێ یەکی ئۆنس ئەڵکۆڵ متابولیزە (یانی تێکشکاندنی ئەڵکۆڵ بەئاو و کەربون دیئۆکسید) بکا و لە جەستە دەری کا! لە سەتا نەوەدی ئەم رەوتە لە جەرگدا و لە سەتا١٠ لە رێگای میزکردن، هەناسەدان و ئارەقەکردن روو دەدا. کەسانێکی زۆر لەسەر ئەم باوەڕەن کە خواردنی قاوە و چایی، حەمام کردن بە ئاوی سارد و وەرزش کردن دەتوانێ شوێنکاری ئەڵکۆڵ لە نێو ببا و هەر ئەم مەسەلەیە دەتوانێ هۆی وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل و مردنی ئەم کەسانە بێ. خواردنەوی قاوە نە تەنیا شوێنکاری ئەڵکۆڵ ناهێنێتە خوارێ، بەڵکو خواردنی قاوە دوای ١ چەتۆر تا ٢ چەتۆر(پەیک) ئەڵکۆڵ، هێزی ئۆتۆمبێل لێخورینی پیاو بەنسیبەتی کاتیک کە مرۆڤ تەنیا ئەڵکۆڵ دەخواتەوە ٢تا ٣ کەرەت دەهێنێتە خوارێ.

جەستەی مرۆڤ بۆ هاتنەوەی بۆ سەر حاڵەتی هوشیاریی، نیازی بە کات و ماوە هەیە و دەبێ ئەم دەرفەتە بە جەستە بدرەێ تا ئەرکی تایبەتیی خۆی بەجێ بهێنێ.

(یەک چەتۆر = ١٢ ئونس ئابجو، ٥ ئونس شەڕاب، یەک و نیو ئۆنس لیکۆر)

## ئاكامەكانی كۆمەڵایەتیی ئەڵكۆڵ خواردنەوە:

خواردنەوەی لە رادەبەدەری ئەڵكۆڵ كارتێكردنێكی خراپی لە سەر ژیانی دەیان میلیۆن كەس لە دونیادا هەیە. هۆی رووخانی بنەڕەتی ژیانی هاوبەشیی، كەم بوونەوەی ماوەی ژیانی هاوبەشیی، كەم بوونەوەی ژیانی مام ناوەندی ئەو كەسانە تا ١٥ساڵ، چوونەسەرەوەی خەرجی چارەسەریی پزیشكیی وخەرجی گرانی بیمە، دابەزینی بەرهەمی كار، چوونەسەرەوەی رادەی وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل و نەخۆشییەكانی هاوپێوەندییدار لەگەڵ ئەڵكۆڵ، هەروەها زۆربەی تاوانكاریی و دستدرێژییكردنەكان بۆ سەرمنداڵ و ژنان ئاكامی خواردنەوەی لە رادەبەدری ئەڵكۆڵە.



بەرهەمهێنان و بەكارهێنانی ئەڵكۆڵ لە ساڵانی رابردودا نە تەنیا كەمنەبۆتەوە، بەڵكو دەیان لەسەر سەد، بەتایبەتیی لە وڵاتانی دواكەتودا چۆتەسەرێ، بۆ وێنە لە ١٥ساڵی رابردودا خواردنەوەی ئەڵكۆڵ لە هیند لە سەدا ١٧١ و لە ئەندەنوسیا تا سەتا٥٠٠ چۆتە سەرێ.

ئەڵكۆڵ ساڵانە دەبێتە هۆی مردنی پتر لە ٢میلیۆن كەس لە دونیادا، نزیك بە سەتا ١٠ی تەواوی نەخوشیی و ئازارەكان لە پێوندیی لەگەڵ ئەڵكۆڵدان. تەنیا لە ئەمریكای باكووردا ساڵانە ٢٠٠ هەزار كەس بەو نەخوشییانە دەمرن كە كارتێكردنی ئەڵكۆڵ پێكی هێناون. ٢٥ هەزار كەسیش ساڵانە لەمەر خواردنەوەی لە رادەبەدەری ئەڵكۆڵ تووشی وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل دەبن و دەكوژرین! (لە ئەمریكادا ساڵانە٥٠ هەزار كەس بە هۆی وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل گیانی خویان لە دەست دەدەن). خەرجی ساڵانەی گیرو گرفتەكانی ئەڵكۆڵ لە ئەمریكادا پتر لە ٣٠٠ بیلیۆن دۆلارە.

بــه پێــی ســەرژمێری کــه لەبــەر دەســت دایــه لە ســەتا٥٠ی ئاکــاره ناشیرینەکانی نێوان ژن و مێرد و یا دایک و باوک لەگەڵ منداڵـەکانیان لـه پێوەنــدیی دەگەڵ ئەڵکۆڵدایــه. لــه ئــەمریکادا نیــوەی تاوانکارییەکــان، له سـەتا٦٠ی دەسـتدرێژیی جنسـیی بـه منداڵان و له سـەتا ٥٠ی دسـتدرێژیی جنســیی بــه ژنــان، له ســەتا٥٣ی مــردن بــەهۆی ئــاورگرتن پێوەنــدیی راســتەوخۆی لەگــەڵ خــواردنەوەی لــه رادەبــەدەری ئەڵکــۆڵ هەیــه. لێــرەدا ســەرچاوەیەکی بــاوەڕپێکراو لەســەر خواردنــەوەی ئەڵکــۆڵ لــه ئێــران و کوردستان لەبەر دەستدا نییه، نەبوونی ئەم سەرژمێریانه نیشانەی نـەبونی مەسەلەکه له کۆمەڵدا نییه، بەڵکو نیشاندەری ئاوری ژێرخوڵەمێشـه. بەشـیک لـەو سـەرژمێرییانه کـه لـه دپارتمانەکانی(بەشـی) پسـیکۆلۆژیی زانسـتگاکانی ئێــران بەشــێوەیەکی بەربەنــدکراو لــه نێــوان خوێنــدکاران و بەشــێک لــه جەماعەتی گەنج کراوە، نیشاندەری چوونەسـەرەوەی خـواردنەوی ئەڵکۆڵ و بەکارهێنانی کەرەستەی سڕکەر له ئێراندایه.

**ئاکامه پزیشکییەکانی خواردنەوەی له رادەبەدەری ئەڵکۆڵ:**

هەر چەند که خواردنەوی رۆژانەی چەتۆریک ئەڵکۆڵ بۆ ژنان و یـەک تـا دوو چەتـۆر بـۆ پیاوان دەتوانێ کـارتێکەرییەکی باشـی لـه سـەر کـاری دڵ هــەبێ و مەترســیی نەخۆشــیی دڵ و رەگەکــان بهێنێتــه خــوارێ، بــەڵام خواردنەوەی له رادەبەدەر و بـەردەوامی ئەڵکۆڵ دەبێتـه سـەرچاوەی گـەلێک نەخۆشیی جۆراوجۆری جەسته و بیـری مـرۆڤ؛ کـه ئێمـه لێرەدا بـەکورتی باسیان دەکەین:

- ئێتـانۆل بـه لـه نـاوبردنی بەشـێک لـه خانەکـانی مێشـک دەبیتـه هـۆی هاتنــەخوارەوەی کــاری مێشــک، فەرامۆشــیی، خــەمۆکیی و توڕەبــوونی لەڕادەبەدەر، خەیاڵیبوون(وەهم و گومان) .... .




- ئێتانۆل ئەرکی راکێشانی ڤیتامینەکان لە ریخۆڵە باریکەدا، هەروەها خەزن بونیان لە جەرگدا کەم دەکاتەوە.
- ئێتانۆل دەبێتە هۆی هاتنەخوارەوەی پتاسیۆم، کالسیۆم، فۆسفۆڕ، مەنیزیۆم و ئەسیدفۆلیکی نێو خوێن. ئەم رەوتە دەبێتە سەرچاوەی کەم خوێنیی، رژانی توکی سەر، نارەحەتیی پێست، نەخۆشیی ئێسک و ماسولکەکان، لێدانی نارێک وپێکی دڵ و هتد... .
- زۆر خواردنەوەی ئێتانۆل بە زگی بە تاڵ دەبێتە هۆی هاتنەخوارەوەی شەکرەی خوێن بۆ ماوەی ٦ تا ٣٦ کاتژمێر.
- خواردنەوەی ٣ تا ٤ چەتۆر ئەڵکۆڵ لە رۆژدا مەترسییشێرپەنجەی دەم وگەرو ، قورگ تا ٣ قات زیاتر دەکا.
- لە سەتا٤٠ی ئەوانەی کە نەخۆشیی لووی شپیلکیان(لوزالمعدە) هەیە رۆژانە پتر لە ٣ چەتۆر ئەڵکۆڵ دەخۆنەوە.
- لە سەتا ١٥ تا ٣٠ی ئەڵکۆلییەکان، نەخۆشیی جەرگ و بە تایبەت سیروز[١٧٦] دەبیندرێ.

176 Cirrhosis

- ڕادەی شـێرپەنجەکان لـە نێـو ئەڵکۆلییەکانـدا ١٠ قـات زیـاترە لەو کەسانەی کە ئەڵکۆل کەم دەخۆنەوە یان نایخۆنەوە.
- خواردنـەوەی لـە رادەبـەدەری ئەڵکۆل دەبێتـە هـۆی بەرزبوونـەوەی فشاری خوێن، تێکچونی ئاهەنگی دڵ و گەورەبوونی دڵ.
- زۆر خواردنەوەی ئەڵکۆل هێزی جنسیی پیاو دێنێتە خوارێ، دەبێتـە هۆی کەمبوونی ئیسپرماتۆزوئیدەکان و نەزۆکیی پیاو.
- خواردنەوەی لە رادەبەدەری ئەڵکۆل دەبێتـە هـۆی ژەهراویی بوون و تەنانەت مردن. بۆ وێنـە لـە روسـیادا سـاڵانە پتر لـە٤٠هەزار کـەس لەبـەر ژەهراویی بوونی ئەڵکۆلیی گیانی خۆیان لە دەست  دەدەن.
- ئەوانەی کە هاوکـات لـە کـاتی خـواردنەوەی ئەڵکۆل جگەرەدەکێشـن دەبێ ئەوەیان لە بەرچاو بێ کە "ئەڵکۆل و تووتن" یەکتر بەهێزتر دەکـەن، بـە شێوەیەک کە لە نەبوونی هـەر کـام لەوانەدا مەترسیی نەخۆشـیی شـێرپەنجە سێ لەسەر چوار(لە سەتا ٧٥) کەم دەکاتەوە.
- ئەڵکـۆل هــەروەها کاریگــەریی خراپــی لەســەر چــاو، گورچیلــە و ئەندامەکانی دیکەی جەستە هەیە.
-

**سەرچاوەکان:**


Alcohol ،by judy monroe،1994 ،USA

Alcohol use and abuse،by Bonnie Grave 2000،USA

Drinking a risky business، by .Laurence pringle،1997،USA

Alcohol،by Michael V.Uschan،2002،USA

Forces of habit،by David T.Courtwright،2001،USA

Harrison’s Principles of INTERNAL MEDICINE،15th edition،2001،usa

Internet:www.alcoholmd.com

Pharmocology by Mary J.Mycek &…. 2000،USA

## چوونه سەرێی فشاری خوێن







ئەمڕۆ کەکەمتر کەسێک هەیە کە وشەی فشارخوێنی نەبیستبێ. زۆر جار لەم و لەو دەبیسرێ کە دەڵێن: فشاری خۆێنم لە سەرەوەیە، سەرم ئێشێ، جاروبارە خوێنی لوتم بەردەبێ، گوێچکەم دەزرینگێتەوە، بەرچاوم لێڵ دەبێ.

بە راستی فشاری خوین چیە و چ رۆڵێک لە سەر لەشساغی مرۆڤ دادەنێ؟ هۆکانی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن کامانەن و مروڤ بۆ پاراستنی لەشساغی خۆی پێویستە چ بکا؟

### فشاری خوێن

پاش هەرلێدانێکی دڵ، خوێن لە لای چەپی دڵەوە دەڕژێتە نێو " ئائۆرت" و لەوێشەوە دەچێتە نێوڕەگەکانی دیکەوە. تێپەڕینی خوێن بە نێو رەگەکاندا

شەپۆلێک پێکدێنێ کە بۆ وێنە لە دەستدا وەکو چڵ[177] هەستی پێدەکرێ. فشاری خوێن پاش لێدانی دڵ و رژانی بۆ نێو رەگەکان لەوپەڕی خۆیدایە، کە لە پزیشکییدا پێی دەکوترێ فشاری "سیستۆلە"[178]. گەڕانەوەی خوێن بۆ نێو دڵ، کەمترین فشاری هەیە کە پێی دەکوترێ فشاری" دیاستۆلە"[179].

فشاری خۆێنی مروڤ لە ٢٤ کاتژمێری رۆژ و شەودا تووشی گۆڕان دەبێ کە ئەویش لە پێوەندیی لەگەڵ جموجوڵێ فیزیکیی جەستە، هەلومەرجی رۆحیی، ئێش، دەنگ و هاوار، گەرمیی و ساردیی، باری تایبەتیی سروشت، خواردنی قاوە، جگەرەکێشان، بەکارهێنانی دەوا و دەرمان لە کاتەکانی رۆژ و شەودایە. ئەگەر فشاری خوێنی مرۆڤ لە ١٤٠ لە سەر ٩٠ میلیمەتری جیوە(١٤٠ سیستۆلی و ٩٠ دیاستۆلی)، تێپەڕێ، بەم حاڵەتە دەکوترێ "هیپێرتانسیۆن"، یانی ئەو مرۆڤە فشاری خوێنی لە سەرەوەیە.

لە لایەن ناوەندی دۆزینەوە، لێکۆڵینەوە و دەرمانی فشاری خوێن( JNC ) لە ساڵی ١٩٩٣دا دەستەبەندی خوارەوە بۆ فشاری خوێن پێشنیار کراوە:

| | فشاری سیستۆلی (میلیمەتری جیوە) | فشاری دیاستۆلی (میلیمەتری جیوە) |
|---|---|---|
| پلەی یەک | ١٤٠ تا ١٥٩ | ٩٠ تا ٩٩ |
| پلەی دوو | ١٦٠ تا ١٧٩ | ١٠٠ تا ١٠٩ |
| پلەی سێ | ١٨٠ تا ٢٠٩ | ١١٠ تا ١١٩ |
| پلەی چوار | زیاتر لە ٢١٠ | زیاتر لە ١٢٠ |

177 Puls
178 Systolic pressure
179 Diastolic pressure

## چەشنەکانی چوونەسەرێی فشاری خوێن:

فشــاری خــوێن بــە پێــی هــۆی پێکهێــنەر بــە فشــارخوێنی "ســەرەکیی"(لە سەتا ٩٠، هۆیەکەی نادیارە)، وفشار خوێن بە هۆی نەخۆشییەکانی دیکەوە وەکـو: نەخۆشـیی گورچیلـەکان، نەخۆشـیی ئـائۆرت، رەگـی بـان گورچیلـە، هـەروەها بـەکارهێنانی حـەبی پێشـگیریی لـە منداڵداربوون لـە لایـەن ژنانـەوە، دابەش دەکرێ. "فشار خۆێنی سەرەکیی" بەتایبەت لە نیوان رەش پێستەکانی ئەمریکادا دەبیندەرێ(لەسەتا ٣٠).

## فاکتۆرەکانی مەترسیی چوونەسەرەوەی فشاری خوێن:

ئەم فاکتۆرانەی خوارەوە پێوندییان بەپێکهاتنی فشاری خوێنەوە هەیە:

**a)** چوونەسەرەوەی تەمەن،
**b)** جگەرەکێشان،
**c)** نێرینەبوون (لە پیاواندا نیسبەت بە ژنان زیاترە)،
**d)** لە رەگەزی رەشەکانی ئەمریکادا پترە لە سپییەکان،
**e)** قەڵەویی،
**f)** بوونی ئەو نەخۆشییە لە باوک، دایک و باو باپیراندا،
**g)** سترێسی رۆحیی(سایکۆلۆژیک)،
**h)** خواردنی زۆری سۆدیوم (لەخوێدا هەیە).

## نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە و ئاڵۆزییەکانی

لـە سـەرەتادا لـە زۆربـەی نەخوشـەکاندا نیشـانەیەکی تایبـەتیی نابینـدرێ بـەڵام پـاش سـەخت بـوون و هەڵـدانی نەخۆشـییەکە، رەنگبـێ سـەرئیشـە، بەربوونی خوێنی لوت، لێڵ و تاریک بوونی بەرچاو سـەرهەڵدات . فشـاری خــوێن یەکێکــە لــە گرینکتــرین هۆیــەکانی پێکهێنــەری نەخۆشــیی دڵ و

ڕەگەکان،هەروەها سەکتەی مێشک، ناتەواویی گورچیلە، رئتینۆپاتیی[180](زیان گەیشتن بە تۆڕی چاو) و نەخۆشیی دەمارەکانی پەراوێزیی جەستە ( ئەوانەی کە لە دڵ دوورن). نیسبەتی چوونەسەرەوەی نەخۆشیی دڵ و ڕەگەکان ، پێوەندیی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ چوونەسەرەوەی فشاری خوێنەوە هەیە.

**چارەسەری فشاری خوێن بە بێ بەکارهینانی دەرمان:**

گۆڕینی شێوەی ژیانی نەخۆش ڕۆڵێکی گەورەی لە سەر چارەسەری ئەم نەخۆشییەیە هەیە و دەتوانێ ڕۆڵی بنەڕەتیی لە سەر کەمکردنەوەی مەترسیی نەخۆشیی دڵ و ڕەگەکان هەبێ. بۆ وێنە وەلانانی جگەرەکیشان دەتوانێ بە شێوەیەکی بەرچاو مەترسییەنەخۆشییدڵ و ڕەگەکان و ئەندامەکانی دیکەی جەستە وەکو مێشک، چاو و گورچیلە، کەم کاتەوە.

کەم کردنەوەی قورسایی جەستە (لاوازبوون) لەو کەسانەیدا کە قورسایی لەشیان لە سەتا ١٠ زیاتر لە قورسایی ئاساییە، دەتوانێ ببێتە هۆی کەمکردنەوەی بەکارهێنانی دەرمانی شیمیایی(کیمیایی) و کەم بوونەوە و ئاسایی‌بوونی " کۆلسترۆڵی"خۆێن.

لە بیرمان نەچێ کە ژنانی دووگیان دەبێ خۆیان لە کەمکردنەوەی قورسایی جەستە بپارێزن. کەم خواردنەوەی ئەڵکۆڵ (تا نزیکی٣١ گرەم لەڕۆژدا) ڕۆڵێکی گرنگ لە سەر چارەسەری ئەو نەخۆشییەیە دادەنێ."ئێتانۆل"(بەرهەمی ئەڵکۆڵ لە جەستەدا) دەبێتەهۆی تەنگبوونەوەی ڕەگەکان و لە ئەنجامدا چوونەسەرەوەی زۆرتری فشاری خوێن.

---

180 Retinopathy








وەرزشـی بـەردەوام بـە هـۆی هێنانـەخوارەوەی قورسـایی جەسـتە و چوونەسـەرەوەی سـۆدیۆم لـە جەسـتەدا، رۆڵێکـی بـەرچاویی لـە هێنانەخوارەوەی فشاری خوێندا هەیە. ئەم وەرزشانە پێویستە، هیچ نەبێ سێ کەرەت لە حەوتویەکدا و هەر جاریش بۆ ماوەی نیو کاتژمێر بکرێن. ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشیی فشاری خوێنن و لەگەڵ ئەویشدا نەخۆشیی کەم گەیشتنی خوێنیان بە دڵ هەیە، یان تەمەنیان لە چل ساڵ تێپەڕبووە و فاکتۆرەکانی مەترسیی بۆ ئەندامەکانیتریان هەیە (کە لە پێشدا نێومان بردن)، دەبێ لە زووترین کاتدا لەگەڵ دوکتۆرەکەیان سەبارەت بە وەرزش و چۆنایەتی وەرزشکردن راوێژ بکەن.

**رژێمی خواردن:**

کـەم کردنـەوەی خـواردنی سـۆدیوم کـەمتر لـە ٦ گـرەم لـە رۆژدا (کـەمخواردنی خـوێ)، هـەروەها کەمکردنـەوەی چەوریـی خـواردن دەتـوانن رۆڵێکی بەرچاویان لە هێنانەخوارەوەی فشاری خوێندا هەبێ. بەکارهێنانی هەر چەشنە دەرمانێک دەبێ لە ژێر چاودێریی دوکتۆری پسپۆڕدا بێ.

## پشت ئێشە



کەم کەس هەیە کە لە درێژایی ژیانیدا بە هۆی ئێشەوە، هەستی بە گرنگی ئێش لە ژیاندا نەکردبێ. زۆربەی خەڵک تەنیا لایەنی نەرێنیی ئێش لەبەرچاو دەگرن، بە هۆی رەنج و تاڵیی ژیانی دەزانن. هەر بە راستیش ئێش بۆ هەر گیان لە بەرێک مایەی رەنجی لە رادەبەدەر و دوور لە تاقەتە. ئێش کاتی بریندداربوون، ددانئێشە، پشت ئێشە، ئێشی ژنان لە کاتی منداڵبووندا و هتد ... . بە چاو خشاندنێک بە لایەنەکانی جۆراوجۆری ئێشدا دەردەکەوێ کە هەست بە ئێش بۆ خۆی دەنگدانەوەی سیستەمی بەرگریی جەستەە بۆ راگرتنی لەشساغی و پاراستنی ئەو وەک هەوڵ لە هەنگاوی درێژەی ژیاندا. "نۆربێرت وینێر" داهێنەری زانستی سیبرنێتیک دەڵێ: "بۆ مروڤ چارەنوسێک تاڵتر لەوە نیيە کە هەست بە ئێش نەکا".

گرنگیی چارەنووسسازی"ئێش" کاتێک دەکەوێتە بەرچاو کە هەبوون و نەبوونی ئەو هەستە لە مرۆڤدا دەکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوە. لە سەرچاوە

پزیشکیی‌یەکاندا بە زیاتر لە سەت مرۆڤ ئیشارە کراوە کە بە هۆی نەبوونی هەستی ئێشەوە تووشی برینداریی، نەخۆشیی و کارەساتی گەورە و چکۆلە و تەنانەت مردن بوون . ئێمە لێرەدا تەنیا ئیشارە بە وێنەیەک دەکەین: کچێکی گەنجی کەنەدیی کە خوێندکاری زانستگای مونترِیاڵی کەنەدا بوو، لە درێژایی تەمەنی‌دا هەستی بە ئێش نەکردبوو. ئەو لە سەردەمی منالّی‌دا تووشی سووتانی پلەی سێ، چەند جاریش بەهۆی برینداریی جۆراوجۆرەوە کەوتوبووە بەشی ئۆرتۆپێدیی و نەشتەرگەریی. هیچ هاندەرێک تەنانەت کارەبا و ئاوی کوڵاو و هتد... کاری نەکردبوو سەر هەستی. هەرگێز نەکۆخی‌بوو، نەپژمی‌بوو و کاتێک شتێک کەوتبێتە چاویەوە، هەستی بەنارِەحەتیی نەکردبوو، بە کورتی ئەو بێبەش لە کاردانەوەی سیستمی بەرگەریی جەستە بوو، هەر بۆیەش لە تەمەنی ٢٩ ساڵی‌دا بەهۆی نەخۆشیی چڵکیی‌یەوە(هەوکردن) گیانی خۆی لە دەستدا.

بەم پێ‌یە، ئێش خاوەنی پێناسەی دژ بەیەکە، لە لایەکەوە دیاردەیەکی ئاسایی و فیزیۆلۆژیکە کە بە هۆی بەرگریی و پاراستنی لەش لە مەترسیی جۆراوجۆر، دەورێکی بە کەڵک لە ژیانی مرۆڤدا دەگێرِێ، لە لایەکی‌ترەوە، ئێش‌بە تایبەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر و بەردەوام درێژەی هەبێ، دەبێتە هۆی ئازاری مرۆڤ و بە واتەیەکی‌تر"پاتۆلۆژیی‌کە" و نیازی بە چارەسەر هەیە.

دەکرێ بڵێین زۆربەی زۆری خەڵکی بە ساڵداچوو پشت ئێشە دەناسن. ئەو ئێشە دەتوانێ دوای کاری درێژخایەن لە حاڵەتی پشت کوورِیی‌دا، پیاسەی دوور و درێژ، هەڵگرتنی شتی قورس، کاتی نەخۆشیی هەڵامەت و هتد ... سەرهەڵدات. ئەو ئێشانە کاتیین و پاش ماوەیەکی کورت تەواو دەبن، هەر بۆیەش لەوانەیە، ئەو کەسانە نەچنە لای دوکتور. دوای کاری قورس و ماندووبوونی جەستە، ئێشێکی کەم لە پشت، دەست و پێ‌دا دەسپێدەکا، بەڵام جاروبار هەست بە ئێشێکی توند لە پشت دەکرێ کە مرۆڤ دەبێ لە

جیدا بۆی بکەوێ. راوەستان و دانیشتن تەنانەت جوولانەوەش ئازاری دەدا. جوولـەی زۆر بـە ئەسـپایی وەکـو هەناسەکێشـانی قـووڵ، کۆخـە و پشـمە، ئێشەکە زیاد دەکەن و مرۆڤ لێدەبڕێ بچێتە لای دوکتور.

دەرمانی پشت ئێشە بە پێی هۆکاری ئێشـەکەوە جیاوازە و بریتییە لـە عیلاجی کۆنزێرڤاتیڤ (دەرمانی نانەشتەگەریی) یا نەشـتەرگەریی. یـەکێک لـە شـێوە چارەسـەرەکان بـۆ کەمکردنـەوەی ئێشـی پشـت، وەرزشـی جەسـتەیە. ئامـانج لـەم وەرزشـە هێنانـەخوارەوەی فشـار لـە سـەر دیسـکەکانی نێـوان مۆرەکـان و باشـترگەیاندنی خـوێن و شـتی پێویسـتیتر بـۆ ئـەو جێیـە و پێشگیریی لە بێ حەرەکەتیی مۆرەکانی(فەقەرات) پشتە. ئەو وەرزشانە کە بە داهـاتنەوە بـۆ پێشـەوە دەکـرێن، دەبنـە هـۆی کرانـەوەی مـەودای پشـتەوەی نێوان مۆرەکان و گەورەتربوونی کونی بەینی مۆرەکان، کە لـە ئاکامـدا فشـار بۆ سـەر دەمـارەکانی پشـت کـەم دەکـا، دیسـکەکان هەڵدەسـتنەوە و لـە جێی خویـان فیکسـە دەبـن. ئـەمڕۆ چەشـنی جۆراوجـۆری وەرزشـی جەسـتە بـۆ کەمکردنەوەی پشت ئێشـە هەن کە ئێمە بڕێکیان باس دەکەین. ئـەوەش بڵێین "**کە دەبی لەو وەرزشانەی کە ئێشی پشت زیاتر دەکەن خوبپارێزرێ**".

**حاڵەت: راکشان لە سەر پشت:**

١- بە ئارامیی ئەژنۆ بچەمێننەوە و بەرەو لای سنگی بێنن ( ئەو جوڵەیـە کاتێکە کە هەناسەدان داوەتە دەر و سییەکان هەوایان تێدا نـەماوە). دوایی پێ دەگەرێننەوە سەر جێی خۆی(کاتی هەڵکێشـانی هەناسـە). ئـەو جوڵەیـە بـە قاچەکەیتریش دووپات دەکەنەوە. دەکرێ ٦ تا ٨ جار درێژە بـەو حەرەکەتـە بدرێ.

٢- قاچەکان رێک راگرن و بە نۆبە و بە ئارامیی لە کاتی دانـە دەرەوەی هەناسـە، بەرزیان کەنەوە و لـە کـاتی هەناسـەکێشـاندا بیانهێننـەخوارەوە (٨ تـا ١٠ جار دەتوانن دووپاتیکەنەوە).

٣- قاچەکان بە نۆبە و لە کاتێکدا ئەژنۆتان چەماندۆتەوە، لە کاتی دانەدەرەوەی هەناسە، بۆ لای دەرەوە و لە کاتی کێشانی هەناسەدا بۆ نێوەوە بیگەڕێننەوە (٨ تا ١٠ کەڕەت دەکرێ دووپاتی کەنەوە).

٤- قاچ رێک راگرن و بە نۆبە، کاتی هەناسەکێشان هەڵیهێنن تا ئەو جێگایەی هەست بە ئێش دەکەن، پاشان بۆ لای راست و چەپی بەرن و لە کاتی هەناسەدەرداندا بیهێننەوە خوارەوە. ئەو جوڵەیە بەهەر دوو قاچ بکەن (٤ تا ٦ جار).

٥- قاچ رێک راگرن و بیبەنە سەرەوە و پاشان ٣٦٠ پلە بیخولێننەوە (دەورێکی تەواو) بە راست و چەپدا و بە قاچەکەیتریش هەر ئەو کارە بکەن (٣ تا ٤ جار).

**حاڵەت: بە لای چەپدا راکشێن: دەستی چەپ لە ژێر سەر دانێن و دەستی راستتان وەک پاڵپشتێک لە پێشەوەی سنگ راگرن. ئەو کارە لە سەر لای راستیش دووپات کەنەوە.**

٦- قاچ رێک راگرن و کاتی هەناسەکێشان بیبەنە سەر و کاتی دەردانی هەناسە بیهێننەوە خوارێ. هەر ئەو کارە بەقاچەکەیتریش بکەن (٣ تا ٤ جار).

٧- قاچ رێک راگرن، تا بۆتان بکرێ بیکێشنە پێشەوە، بە شێوەیەک سەری قامکەکانتان لە سەر زەوی بدرێ. دوایی بیگەڕێننەوە سەرجێی خۆی. هەر ئەو جوڵەیە جارێکیش بە پێچەوانە، یانی قاچتان بۆ دواوە بکشێنەوە و دوایی بیگەڕێننەوە. هەر ئەو کارە بە قاچەکەی دیکەش بکەن - ٤ تا ٦ جار).

جوڵەکانی ٦ و ٧ دەکرێ هاوکاتیش بکرێن، یانی ئەگەر هەر دوو جوڵەکە لە سەر لایەک تەواو بوو، لە سەر لایەکەی دیکە راکشێن و هەر دووکیان بەو لایەشدا بکەن.



**حاڵەت: لە سەر پشت درێژ بن:**

٨- هەر دوو دەست ڕێک لە درێژایی موورەغەی پشت ڕاکێشن، بە شێوەیەک کە لەپی دەست لە سەر عەرز بێ. هەر دوو قاچ تا ئەو جێگەیەی دەتوانن بکێشنە پێش (٨ تا ١٠ جار).

٩- قاچێک لە ئەژنۆوە بچەمێننەوە و بەری پێ لە سەر زەوی دانێن، قاچەکەیتر ڕێک هەڵێنن، هەروا لە ئەژنۆدا بیچەمێننەوە و دوایی ڕاستی کەنەوە و بیهێننەوە خوارێ. ئەو کارە بە قاچەکەی دیکەش بکەن ( ٨ تا ١٠ جار).

**حاڵـەت: لەســەر زگ درێـژ بـن و دەســتەکانتان جۆرێـک بخەنـە ژێـر چەناگەوە کە لەپی دەستتان بکەوێتە بن چەناگە.**

١٠- کاتی هەناسەهەڵکێشان قاچتان ڕێک هەڵێنن و لە کاتی دانەدەرەوەی هەناسـە بیهێننــەوە خــوارێ. هــەر ئــەو کــارە بــە قاچەکــەیتریش بکــەن (٦ تا٨ جار).

١١- قاچتان لە ئەژنۆدا ٩٠ پلە بچەمێننەوە و بە ئارامی هەڵی هێنن. ئەو کارە بە قاچەکەی دیکەش بکەن(٤ تا ٦ جار). ئەو جوڵانە دەکرێ هاوکاتیش بە هەر دوو پێ بکرێن.

١٢- دەستەکانتان ڕێک بکێشنە پشتەوە، بە شێوەیەک لەپی دەست رووی لە سەرەوە بێ. بە ئارامیی دەستەکانتان بقونجێنن(بێ ئەوەی فشاری زیادە بۆ خۆتان بێنن) و لە کاتی دانەدەرەوەی هەناسەدا سەر، سنگ و لاقەکانتان هـەڵێنن. لـە کـاتی هەناسەهەڵکێشـاندا بیانگەڕێننـەوە سـەرجێی خـۆی(٦ تـا ٨ جار).

**حاڵەت: لە سەر پشت درێژ بن!:**

١٣- هەر دوو قاچ لە ئەژنۆودا بچەمێننەوە و بـە یەکـەوە جووتیـان کـەن. دەستەکانتان لە درێژایی جەستەراکێشـن، بـە شـێوەیەک لـەپی دەسـت لەسـەر زەوی بێ. لـە کـاتی دانـەدەرەوەی هەناسـە هـەر دوو ئـەژنۆ هاوکـات بـۆ لای ڕاست بەرن و لە کاتی هەناسەهەڵکێشاندا بیگەڕێننەوە سەر جێی خۆی. ئەو جوڵەیــە جــارێکیش بــە لای چەپــدا بکــەن(٦ تــا ٨ جــار). لــەو حاڵەتــەدا دەتوانن"کاســـیلکە[١٨١]" لـــە کـــاتی دانـــەدەرەوەی هەناســـە هەڵێــنن و لـــە هەناسەهەڵکێشاندا بیهێننەوە خوارێ(٤ تا ٦ جار).

١٤- دەسەکانتان بخەنە پشت سەر و تێکۆشـن بێ ئـەوەی پاژنـەی پێتـان لە عەرز جیابێتەوە، سەر و سنگتات هەڵێنن و دانیشن (٣ تا ٤ جار).

---

١٨١ لەگەن، کزیە

١٥- قاچێکتـان ڕێـک ڕاگـرن و کاتێـک قـاچەکەی دیکەتـان لـە ئـەژنۆدا دەیچەمێننـەوە، بەهـەر دوو دەسـت سـەرەوەی پـووز بگـرن و ڕانتـان بەرەو سـک بکێشـن (ئـەو جوڵەیـە لـە کـاتی دانـەدەرەوەی هەناسـەدایە). کـاتی هەناسەهەڵکێشـان قاچتـان بگەڕێننـەوە جێـی خـۆی. ئـەو کـارە بـە قاچەکـەی دیکەش بکەن(٤ تا ٦ جار).

١٦- دەستەکانتان بخەنە ژێر سەر و قاچەکانتان لە کاتێکدا لە ئەژنۆدا چەماونـەوە ڕێـک ڕاگـرن و هـەر وەکـو سـواری پاسـکیل بـووبن، هەوەڵ بـە لایەکدا و پاشان بە لایەکەیتردا پێ لێدەن. ئـەو جوڵەیـە تـا ئەو جێیـە درێژە پێ بدەن کە هەست بە ماندوویيەکی کەم دەکەن.

١٧- دەستەکانتان لە کاتێکدا کە لەپی دەست لە سـەر عـەرزە بـە درێژایـی لەش درێژکـەن. قاچـەکانتان بـە ئـارامی هـەڵێنن و تـا ئـەو کاتـەی هەسـت بـە ماندوویی دەکەن لە یەکتر دوور و نزیکیان کەنەوە.

١٨- قاچـەکانتان ڕێـک درێژکـەن و لـە سـەر یـەکتریان دانـێن. لـە کاتێکدا قورسـایی جەسـتە دەخەنـە سـەر پاژنـەی پێـی بنـەوە، تێکۆشـن خۆتـان بەلایەکـەیتـردا بادەنـەوە. جێـی قاچـەکانتان بگـۆڕن و ئـەو جوڵەیـە بەلایەکەیتردا دووبارە کەنەوە( ٣تا ٤ جار).

١٩- هەر دوو ئەژنۆتان بچەمێننەوە و بەری پێتان لـە سـەر عـەرز دانـێن. لەو حاڵەتەدا خۆتان بە لایەکدا خوارکەنەوە و قاچتان بە ئارامیی درێژکـەن و تێکۆشن کەمەرتان بجوڵێننەوە.

**لەبیرتان نەچێ کە ئەو جوڵانە نابێ ئێش زیاد کەن، ئەگەر حەرەکەتێک ئێشی پشت زیاد بکا دەبێ دەستی لێ هەڵگرن.**

# کارەساتی جیهانی ئێدز(ئایدز)
## (بە بۆنەی یەکی دیسەمبەر، رۆژی جیهانیی ئێدز)








نەخۆشـیی ئێـدز بـۆ یەکـەمین جـار لـە سـاڵی١٩٨١ لـە نێـو نێربـازانی کالیفۆرنیـادا بـەدی کـرا. ئـەوکات کـەس پێـی وانـەبوو ئـەم نەخۆشـییە لـە ماوەی کورتی٣٠ ساڵدا دەبێ بە یـەکێک لـە کارەسـاتە گـەورە جیهانیی‌ەکان. نەخۆشـیی ئێـدز لـەم ماوەیـەدا هۆکـاری لـە نێوچـوونی زیـاتر لـە ٢٥ ملیـۆن کەس و چوارەمین هۆکاری مردن بووە لە دنیادا. بەپێی راپۆرتی رێکخـراوی تەندروسـتیی جیهـانیی لـە سـاڵی٢٠٠٥ دا زیـاتر لـە ٥ ملیـۆن کەسـی‌دیکە تووشی ڤایرۆسی HIV-1 بـوون. سـێ ملیـۆن و دووسـەد هـەزار کـەس لـەم نەخۆشـانە خـەڵکی خـوارووی بیابـانی ئـەفریقان. ٧٠٠ هـەزار کـەس لـەم کۆمەڵەیـە، منـداڵانی ژێـر ١٥ سـاڵن. ئێسـتا ژمـارەی نەخۆشـەکانی گیـرۆدەی ئێدز، گەیشتۆتە ٤ ملیۆن و ٣٠٠ هەزار کەس، کە لـەم ژمارەیـە ٢ ملیـۆن و ٣٠٠ هەزار کەس منداڵانی خوار تەمەنی١٥ ساڵن.

ژمارەی گیرۆدە بووانی نەخۆشیی ئێدز لە ساڵی١٩٩٥ دا زیاتر لە١٩/٩ ملیۆن کەس بوو. لە ماوەیەکی کەمتر لە١٠ ساڵدا ئـەم ژمارەیـە بـوو بـە دوو

بەرانبەر. زۆرترین گیرۆدە بووانی ئەم نەخۆشییە(دوو لە سێی ئەوان) لەخوارووی بیابانی ئەفریقا دەژین. باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بە٧/٤ ملیۆن نەخۆشەوە، بە دووهەم ناوچە لە باری ژمارەی زۆری گیرۆدە بووانەوە دادەنرێت. لە ساڵی ٢٠٠٥دا نزیکەی٢/٤ ملیۆن کەس لە خوارووی بیابانی ئەفریقا، ٤٠٠ هەزار کەس لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، ١٨ هەزار کەس لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ١٢ هەزار کەسیش لە ئەورووپا بە هۆیئێدزەوە گیانیان لە دەست داوە. لە سەر یەک زیاتر لە ٣ میلیۆن و ١٠٠هەزار کەس بوون بەقوربانیی ئێدز کە٥٧٠ هەزار کەسیان منداڵانی خوار تەمەنی١٥ ساڵ بوون.

بە پێی سەرژمێری سندووقی[منداڵانی] رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەر ١٤ چرکەدا لاوێک و رۆژانە ١٤ هەزار کەس کە نێونجی تەمەنیان لە نێوان ٢٤ـ١٤ دایە، تووشی دەبن. هیند دوای ئەفریقیای باشوور دووهەم وڵاتە کە زۆرترین نەخۆشیگیرۆدەی ئێدزیهەیە. لەو وڵاتەدا زیاتر لە ٤ میلیۆن نەخۆشی گیرۆدەبوو بە ڤایرۆسی HIV-1هەن.

لە بارەی گیرۆدەبووانی نەخۆشیی ئێدز لە ئێراندا هێشتا سەرژمێرییەکی روون و جێگای بڕوا لە دەستدا نییە. بە پیی قسەی سەرۆکی ئیدارەی کۆنترۆڵی وەزارەتی تەندروستیی و دەرمان، لە ئێران ١١ هەزار و ٩٣٠ کەس تووشی ئێدز بوون کە لەم ژمارەیە تا ئێستا ١٣٧٧ کەس مردوون.

**رێگاکانی گوێزرانەوەی نەخۆشیی ئێدز بە زۆریی بریتین لە:**

پێوەندیی سێکسیی لەگەڵ کەسی گیرۆدەبوو بە ڤایرۆسی HIV-1.

گوێزرانەوە بە هۆی خوێن.

دەرزیی(سورەنگ)، کە ئەمەیان زۆرتر لە نێو موعتادەکاندا باوە.

گوێزرانەوە لە دایک بۆ منداڵ، پێش لە دایکبوون یا دواتر.

## بارینی ئەتۆمیی چرنۆبیل
## ئەنجامە پزیشکیی ـ کۆمەڵایەتییەکان
## کارەساتی ئەتۆمیی چرنۆبیل

گەورەترین کارەساتی ئەتۆمیی جیهان، کاتژمێر یەک و نیوی بەیانی ٢٦ ئابریلی ١٩٨٦ لە بلۆکی چواری وزەی بنکەی ئەتۆمیی شاری چرنۆبیل لە کۆماری ئۆکرایندا، ١٢ کیلۆمەتری سنووری باشووری کۆماری روسیای سپی قەوما. دوای ئەم کارەساتەدا بە پانتایی سەت هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە لە زەوییەکانی روسیا، کۆماری ئۆکراین و روسیای سپی کەوتنە ژێر کاریگەریی ماددەی رادیۆئەکتیڤ، بەتایبەت "سیزیۆم،



ئسترنسیۆم و پلۆتۆنیۆم". لە سەتا٧٠ی ماددەی رادیۆئەکتیڤ لە روسیای سپی، لە سەتا١٠ی لە روسیا و لە سەتا ٢٠ لە ئۆکراین، زەوییەکانی ئەو وڵاتانەی داپۆشی. بە پێی راگەیاندنی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووکان نزیکەی ٩ میلیۆن کەس لەخەڵکی یەکێتیی سۆڤێت، ٥.٢ میلیۆن کەس لە روسیای سپی - لەوانە٥٠٠ هەزار منداڵ، ٥.٣ میلیۆن کەس لە ئۆکراین - لەوانە٥.١ میلیۆن منداڵ و ٣ میلیۆن کەس لە دانیشتووانی روسیا کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو ماددەیە. پتر لە



٤٠٤هەزار کەس ناچار کران ماڵ و شار و گوندەکانیان بەجێ بێڵن. ئێستا زۆرتر لە ٤ میلیۆن کەس کە یەک میلیۆنیان مندالّن، لە بەشی داپۆشراو بە ماددەی رادیۆئەکتیڤدا دەژین.

ماددەی رادیۆئەکتیڤ نە تەنیا ئەم وڵاتانی خستە ژێر چەتری خۆیەوە، بەڵکو لە رێگای "تەپ و تۆز و هەوری چرنۆبیلی"یەوە گەیشتە وڵاتانی فنلەندا، نۆروێژ، ئاڵمانیا، فەڕانسا و بلژیک.

کارەساتی ئەتۆمیی چرنۆبیل بەرێژەی ٢٩٦ تەقینەوەی ئەتۆمیی کە لە نێوان ساڵانی ١٩٤٤ تا ١٩٨٨ لە دونیادا رووی دابوو، زۆرترین قوربانیی مرۆیی بەجێ هێشت.




**ناوچەی ژێر کاریگەریی "تەپ و تۆزی چرنۆبیل"**
**بە رەنگی سەوز دیاریی کراوە**

بە پێی راگەیاندنی ڤیکتۆر پویارکڤ سەرۆکی ناوەندی لێکۆڵینەوەی رادیۆلۆژیی ئۆکرینا، پتر لە ٢٥٠٠ کەس لە رووداوەکەی چرنۆبیلدا گیانیان

لەدەستداوە. بە پێی لێکۆڵینەوەکان، بارستایی ئەو رادیۆ ئەکتیوەی کە پاش کارەساتی چڕنۆبیل گەیشتۆتە ئەتۆمسفێر[١٨٢](ئاسمان)،٢٠٠ جار زۆرترە لە ئەو بۆمبەئەتۆمییانەی کە ئەمریکا، لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا، بە سەر شارەکانی هیرۆشیما و ناکازاکیدا رژاندی.



**گوندێک لە٣٠ کیلۆمەتریی چڕنۆبیل**

**بەشیک لەخەڵکیی بۆ ماڵەکانیان دەگەڕێنەوە. دیسەمبەری ١٩٩٥**

ڕووداوی چڕنۆبیل بووەهۆی گۆڕینی ژینگە و دابەزینی هێزی بەرگریی جەستەی مرۆڤ لە بەرانبەر نەخۆشییەکاندا، هەروەها بووە هۆی گۆڕانی جددی هەستیاریی ئۆرگانیزمی مرۆڤ لە ئاست پێکهاتەکانی دەوروبەردا.

بە پێی ئەو سەرژمێریانەی کەوا لە بەر دەستدان رادەی شێرپەنجەی سیستەمەکانی ئیندۆکرین، هەناسە، هاڕین( گەدەو و ریخۆڵە)، خوێن و

---

١٨٢ Atmosphere

پاتۆلۆژیی ژنانی دووگیان و منداڵانی ساوا بەرزبۆتەوە. لە ١٥ ساڵی رابردوودا رادەی شێرپەنجەی پیاوان لە سەتا١.٢٤ و ژنان لە سەدا ٦.٢٢ هەڵکشاوە. پێش کارەساتی چرنۆبیل شێرپەنجەی تیرۆئیدی منداڵان لە کۆماری بیلاروس(روسیای سپی) یەک لە ١٠٠ هەزار بوو، بەڵام دوای کارەساتی ئەتۆمیی چرنۆبیل شێرپەنجەی تیرۆئید لە بیلاروسدا ١٠٠ قات زۆرتر بووە و لە ٣.٠ لە یەک ملیۆن‌دا لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥ – ١٩٨١ گەیشتۆتە ٦.٣٠ لە ملیۆنێک‌دا لە ساڵانی ١٩٩٤ – ١٩٩١.

سەرژمێرییەفەرمییەکانی حکومەتی روسیای سپی نیشاندەری چوونەسەرەوەی رادەی شێرپەنجەی تیرۆئیدە لەو کەسانەی تەمەنیان لەخوار ١٥ ساڵدان. لە ساڵی ١٩٩٠ ئەو رادەیە ٢ هەزار کەس بووە، بەڵام لە ساڵ٢٠٠١ دا گەیشتۆتە١٠ هەزار کەس! بە پێی راگەیاندنی رێکخراوەی یونسێف لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٤ -١٩٩١رێژەی نەخۆشیی سیستمەکانی دەمار، هارین (گەدە و و ریخۆڵە)، ئێسک – ماسولکە، هەروەها شێرپەنجەکان لە سەتا٣٠ تا ٦٠ بەرز بوونەتەوە.

لە کۆمارەکانی روسیە و ئۆکرایندا رێژەی شێرپەنجەکان لە نێوان منالان و ئەو لاوانەی کە لە کاتی قەومانی کارەساتەکەدا تەمەنیان لە بەینی ٣ تا ١٢ ساڵ بووە، زیاتر لەو کەسانە بووە کە بە تەمەنتر بوون. لە" کالۆگا" یەکێک لە ناوچەکانی داپۆشراو بە ماددەی رادیۆئەکتیوی روسیە، لە نێوان ساڵەکانی ٢٠٠٠ – ١٩٨٥دا شێرپەنجەی مەمکی ژنان لە سەتا ١٢١، شێرپەنجەی سییەکان لە سەتا ٥٨، شێرپەنجەی منداڵدان لە سەتا ٨٨، شێرپەنجەی تانەکانی لێنف و بەرهەم هێنەری خوێن تا سەتا ٥٩ چونەتە سەر. شێرپەنجەی تیرۆئید لە روسیە ١٠ قات زۆرتر بووە.

لە کۆماری ئۆکرایندا ٥ ساڵ پێش رووداوی چرنۆبیل، رادەی مامناوەندی شێرپەنجە لە کەسانی ژێر ١٥ ساڵدا، ٤ هەتا ٥ کەس لە

میلیۆنێکدا بووە، بەڵام لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٧ – ١٩٨٦ گەیشتۆتە ٤٥ کەس لە میلیۆنێکدا.

ڕادەی ئەو نەخۆشانەی کە لە شاری کیەف پایتەختی کۆماری ئۆکراین لە ژێر چاودێریی پزیشکدا بوون بەم شێوەیە چۆتەسەرێ: نەخۆشییەکانی سیستمی ئیندوکرین ١٠ جار، هەناسە ٦ جار، سیستمی عەسەبیی، خوێن و تانوپۆی خوێنساز ٥ جار . بە پێی راگەیاندنی "وەزارەتی چرنۆبیلی" ئۆکراین رادەی مردن لە ناوچەکانی گیرۆدە بەڕادیۆئەکتیو تا ٢ قات زۆرتر بوو.

یەکێک لەسەرئەنجامە تاڵەکانی کارەساتی چرنۆبیل کارتێکردنی خراپ لە سەر وەچەی (بەرەی) داهاتوی ئەو وڵاتانەیە، کە ژنانی دووگیان و منداڵی تازە لە دایک بوو دەگرێتەوە. دوای ئەم کارەساتە رادەی نەخۆشیی جۆراوجۆری ژنان چۆتە سەر. کەم خوێنیی لە نێو ژنانی دوو گیاندا ٧.١ جار لە ساڵدا چۆتە سەرێ و نەخۆشیی تیرۆئید گەیشتۆتە سەتا ٨. ٥. نەخۆشییەکانی دیکە وەک نەخۆشیی سیستمی میز- زاوزێ ٧ جار، نەخۆشیی دڵ و رەگەکان ٢ جار و نەزۆکیی ٥.٥ جار زۆرتر بووە. رۆڵی پاتۆلۆژیی ئەسپێرمی پیاوان لە نەزۆکیی دا تا ٦.٦ جار چۆتەسەر و شێوانی هۆرمۆنی ژنانیش تا ٣ قات بەرزتر بۆتەوە.

نەخۆشیی منداڵانی ساوا پێوەندیی راستە وخۆی لەگەڵ نەخۆشیی ژنانی دووگیان و کاتی زایین هەیە. دوای ساڵی ١٩٨٦ نەخۆشییە جۆراوجۆرەکانی منداڵانی شاری مینسک لە سەتا ٥. ٦ ، لە ئەیالەتی گۆمل ٣. ٦ و لە ئەیالەتی ماگلیوف لە سەتا ٥.٥ چۆتە سەر. "موتاسیۆنی" خۆزایی کرومۆزۆمەکان ٥.١ تا ٢ جار زۆرتر و رادەی ئاڵۆزییەکانی تەواوکاریی زگماکیی کە لە ١٧ ناوچەی ئەیالەتی گۆمل و ماگلیوڤدا ٨.٤ ( لە ساڵەکانی ١٩٨٥ – ١٩٨٣) بووە، پاشان گەیشتۆتە سەتا ٦٨.٧. زیاد بوونی رادەی برسییەتی ئوکسیژێنی پز و ساوا یەکێک لە ئاکامە سەرەکییەکانی

کارەساتی چڕنۆبیلە. بە هۆی دابەزینی سیستمی بەرگریی منداڵان، نەخۆشییە جۆراوجۆرەکانی سیستمی هەناسە،هاڕین، دڵ و رەگەکان، گورچیلە، نەخۆشی چڵکیی، شێرپەنجە، هەروەها شێرپەنجەی تیروئید زیادی کردووە. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەبەر دەستدان، بەشێکی گەورە لە منداڵانی روسیای سپی لە ژێر کاریگەریی خراپی تیشکی ماددەی رادیۆئاکتیودا تووشی سێندرومی کزیی بەرگریی جەستە بوون.



**منداڵێکی نەخۆش لەبەشی نەخۆشییەکانی خوێنی نەخۆشخانەی ژومارە١٤ منداڵانی کیەف لەکۆماری ئۆکرائیندا**

کارەساتی "ئیکۆلۆژیکیی"چڕنۆبیل، بڵاوبوونەوەی ماددەی ژەهراویی لە ئاسمانی روسیای سپیدا( *تەنیا لە شاری مینسک پایتەختی کۆماری روسیای سپیدا رۆژانە نزیک بە١٥٠ تۆن ماددەی ژەهراوی دەرژێتە نێو هەواوە*) لەگەڵ قەیرانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی روسیای سپی کاریگەریی خراپی سەر تەواوی بوارەکانی ژیانی گەلی ئاشتیخواز و رەنج کێشاوی روسیەی سپی و داهاتووی وچەکانی ئەم وڵاتەی خستۆتە مەترسییەوە. لە

ساڵی ١٩٩٣ بەو لاوە رادەی مردنی ساڵانە پترە لە رادەی زاوزێ و لە دایکبوون.



ئەگەر لە ساڵی ١٩٨٥ لە کۆماری روسیەی سپی ١٦٥ هەزار مناڵ لە دایک بوون، ئەم رێژەیە لە ساڵی ١٩٩٣ بۆتە ١١٧ هەزار کەس و لە ساڵی ١٩٩٦ گەیشتۆتە ٩٠ هەزار منداڵ. رادەی زاوزێ و لە دایکبوونی منداڵ لە سەتا ٤٣ دابەزیوە. بە پێی سەرژمێری گشتیی ساڵی ١٩٩٣ رێژەی خەڵکی نیشتەجێ لە روسیەی سپیدا ١٠ میلیۆن و٣٦٧ هەزار کەس بووە. ئێستا ساڵانە ٩٠ هەزار کەس لە رێژەی ئەم خەڵکە کەم دەبێتەوە. بە پێی لێکدانەوەی "تیالۆفسکی" ئەگەر ئەم رەوتە بەم چەشنە درێژەی بێ، دوای١١١ ساڵیتر، یانی لە ساڵی ٢١٠٥ ئاخرین دانیشتوانی ئەم وڵاتە لە بەین دەچن.

## سەرچاوەکان:


٢٠) کارەساتی چڕنۆبیل: ڕەهەندی پزیشکیی.مینسك ١٩٩٤

٢١) کارەساتی چڕنۆبیل: هۆ و ئاکامەکانی. بەرگی ١و٣.مینسك . ١٩٩٣و١٩٩٢

٢٢) ئاکامەکانی پزیشکیی کارەساتی بنکەی ئەتۆمیی چڕنۆبیل. مۆسکو١٩٩٥

٢٣) گۆڤاری هماتۆلۆژیی و ترانسفوزیۆلۆژیی. ژمارەی ٦.مۆسکو١٩٩٦

٢٤) رادیوبیۆلۆژیك. بورداکوف و ... مینسك ١٩٩٢

٢٥) باری رادیۆئێکۆلۆژیکی کۆماری بیلاروس دوای کارەساتی ئەتۆمیی چڕنۆبیل. دپارتمانی پزیشکیی رادیو ئاکتیویتەی زانستگای پزیشکیی مینسك.١٩٩٥

٢٦) ئاکامەکانی کارەساتی چڕنۆبیل لەکۆماری بیلاروس. راگەیاندنی نەتەوەیی مینسك١٩٩٦

٢٧) کارەساتی دمۆگرافیك لە بیلاروس. تیالۆفسکی .مینسك ١٩٩٧

٢٨) لەشساغی منداڵانی بیلاروس دوای کارەساتی چڕنۆبیل. زۆبۆیچ. مینسك١٩٩٧

٢٩) ڕۆژنامەی پەڕلەمانی(ڕوسیە) - رۆژنامەی گەل ( بیلاروس).نیکلای گوسەیف ٢٦ ئابریلی ٢٠٠٠

٣٠) پاتۆلۆژیی سیستمی هەناسەی لیکویداتۆرەکان دوای کارەساتی بنکەی ئەتۆمیی چڕنۆبیل. کۆکردنەوەو تەرجومەی مەحەمەد تاهیری موحەمەدی. گۆڤاری پزیشک. ژمارەی ٢، بەهاری ١٣٧٧. مینسک

٣١) دە ساڵ دوای چڕنۆبیل.Greenpeace Canada، Joanne Dufay

٣٢) کارەساتی ئەتۆمیی چڕنۆبیل co.uk www.chernobyl

٣٣) ڕاگەیاندنەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووکان سەبارەت بەچۆنیەتی سێ کۆماری ئۆکراین، روسیەی سپی و روسیە .٢٠٠٣

## نەخۆشییەکانی پڕۆستات




کەم کەس هەیە کە گومانی لە گرنگیی پێوەندیی جنسیی لە ژیانی ژن و مێردایەتی‌دا بێ. بەڵام بە داخەوە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە گرنگیی و ڕۆڵی ئەندامە جنسیی‌یەکان و نەخۆشیی‌یەکانیان ئاگاداریی‌یان بێ، زۆر کەمە. لە ڕاستیشدا، تا کاتێک نیشانەکانی ئەو جۆرە نەخۆشیی‌یانە نەگەیشتونەتە ئەو پەڕی قەیران، ناچنە لای دوکتور، تا نەکا جێگای شەرمیان! پیشان نامەحرەمێک بدەن. جاری‌وا هەیە کە ئەو حەیا و شەرمە بە تایبەتیی لە تەمەنی نێوەنجیدا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ تووشی گیر و گرفت و تەنانەت مەترسیی گەورە و چارەنووس‌سازی نەگەڕاوە بێ.

یەکێک لە ئەندامە گرنگەکانی جنسیی پیاو، کە جاری‌وا وەکو دڵی دووهەمی پیاو پێناسە دەکرێ، پڕۆستاتە. بە پێی راپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیی، لە سەدا دەی پیاوان لە تەمەنی سەرووی پەنجا ساڵیی‌دا، تووشی نەخۆشیی پڕۆستات دەبن. هەوی پڕۆستات نەخۆشیی

هـەرە بـاوی ئەنـدامی میـز و جنسـیی پیـاوە کە بـە شـێوەیەکی بـەربڵاو لـە تەمەنی ٣٠ تا ٤٠ساڵیی پیاواندا کە تەمەنی پڕکاریی جنسیی‌یانە، دەبیندرێ. ئەم نەخۆشیی‌یە لە تەمەنی دواتریشدا، واتە لە پیاوانی بە تەمەنتر و پاش ٥٥ ساڵیی‌دا بینراوە. لە ئەمریکا ساڵانە نزیکەی یەک ملیۆن کەس بەهۆی هەوی پرۆستات دەچنـە لای دوکتـور. بـە پێـی سـەرژمێرییەکان، لـە سـەتا پـەنجای پیـاوان، هـیچ نـەبێ جارێـک لـە ژیانیـان‌دا بـەو هۆیـەوە جارێـک چونـەتـە لای پزیشک. ئەم نەخۆشیی‌یە لە هـەموو جیهانـدا هەیـە. بـەڵام، لـەو ناوچانـەی کـە ساردن و شێی‌هەوا لە سەرێیە زیاترە هەتا ناوچە گەرم و وشکەکان.

گەورەبوونی پرۆستات، نەخۆشیی هـەرە بـاوی پیاوانـە پـاش تەمـەنی ٥٠ ســاڵیی. لــە ئــەمریکادا، لە سەتاهەشــتای ئەو پیــاوانەی کە تەمەنیــان لــە سەرەوەی هەشتا ساڵە، تووشی ئەم نەخۆشیی‌یە دەبن. ئـەم نەخۆشـیی‌یە و نەخۆشـیی شـێرپەنجەی پرۆسـتات، لـە پیـاوانی ئاسـیایی‌دا زۆر کـەمترە تـا پیاوانی وڵاتـانی رۆژئـاوایی. لێکۆڵینـەوەکان پیشـانیانداوە کە خـواردنی سـۆیا (گیایەکە وەکو لۆبیا کە درێژ و باریکـە و زۆرتـر لـە وڵاتـی چین دەخورێ)، دەتـوانێ هـۆی ئـەم کـارە بـێ، (واتـا بـەرگرتن لـە شـێرپەنجەی پرۆسـتات). وێچوونی شێرپەنجەی پرۆستات لە پیاوان، پاش٥٠ ساڵیی‌دا لە سـەتا ١٤ تـا ٤٦- ە. لە ئەمریکـادا شـێرپەنجەی پرۆسـتات دووهـەمین پلـە و لـە بـەریتانیادا پێنجەمین پلـەی لـە نێـو شـێرپەنجەکانی دیکەدا هەیـە. ئـەم شـێرپەنجەیە پێش ئەوەی‌کە تەمەنــی پیــاوان بگاتــە ٤٠ ســاڵیی زۆر بەدەگمــەن دەبینـدرێ. لــە ئەڵمانیادا ساڵانە دە هەزار کەس بەهۆی شێرپەنجەی پرۆستاتەوە دەمرن.

بۆ ناسین و چارەی نەخۆشیی‌یەکانی پرۆستات، کۆنترۆڵی پرۆستات لـە پـاش ٤٠ سـاڵیی پێویسـتە. بەداخـەوە لـە زۆربەی وڵاتەکـان و تەنانـەت لـە ئەوروپاشدا، پیاوان زۆر ئارەزوومەندی ئەو جۆرە کۆنترۆڵانە نین. بۆ وێنە لە وڵاتێکی وەکو ئاڵمانیادا تەنیا لە سەدا حەڤدەی پیـاوان سـاڵانە بـۆ کـۆنترۆڵی پرۆستات دەچنە لای پزیشک.

لێرەدا تێدەکۆشین کە بە کورتی باس لە پرۆستات و نەخۆشییەکانی بکەین تا پیاوان زۆرتر لە سەلامەتی خۆیان ئاگادار ببنەوە.

**پرۆستات** لوویەکی ١٠ تا ٢٥ گرەمییە کە لە شێوەی بەڕوو، یانیش بەقسەی پسپۆڕان، وەکو دڵ وایە. ئەو لوویە سێ سانتیمەتر درێژ و ٤ سانتیمەتریش پانە، دوو سانت و نیویش ئەستوورییەکەیەتی و لە پشتی میزەڕێدایە. پرۆستات پێکهاتەی ٣٠ تا ٥٠ ئاسینووسە ( کیسە بچوکەکانی ناو لوو) و لە کاتی ئاوهاتنەوە و رەحەت بوونی پیاو لە ئاخر قۆناغی پێوەندی جنسییدا لە سەتا ٢٥ تا ٣٥ی ئاوی پیاو پێ کدێنێ.

**هەوی پرۆستات**. میکانیزمی هەوی پرۆستات جارێ بە تەواویی روون نەبۆتەوە. باکترییەکان وەکو ئەشێریا کۆلی[١٨٣] ، کلێبسێلا[١٨٤] و ئێنتێرەکۆکەکانی[١٨٥] ناو میز یان ریخۆڵەی راست لە رێگای میزڕێیەوە بەرەوژوور دەچن، دەبنە هۆی هەوی پرۆستات. ڤایروس، کارگەکان، هەروەها میکرۆبەکانی کلامیدیا، تریکۆمۆناد، سۆزەنەک و هتد ... کە بەهۆی پەیوەندیی جنسییەوە(سێکس) پەیدا دەبن، دەتوانن هۆی هەوی پرۆستات بن. هۆیەکیتری ئەو نەخۆشییە، تێکچوونی توانای هاوئاهەنگی کارایی جنسیی پیاوە. هەندێک لە پسپۆڕان زۆر خواردنەوەی ئەلکۆل، جگەرەکێشان، یان خەم، نیگەرانیی و پەشێویی لە ساتی سێکسدا بە هۆی نەخۆشیی پرۆستات دەزانن. نەخۆشییەکانی میزڕێ، واتە تەنگیی یان برینداریی، یاخود جێگایبرینی پاش چاکبوونەوە، کەمبوونی هۆرمۆنی پیاوانە، زیادبوونی هۆرمۆنی ژنانە لە پیاواندا، مایەسیریی (بواسیر)، هەوی

---

183 Escherichi Coli
184 Klebsiella
185 Enterococci

ریخۆڵە گەورە و یان دانانی زۆند لە میزڕێدا بە هۆی گەورەبوون یان هەوی پڕۆستات دەزانن.

بە پێی ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی هەوی پڕۆستات، ئەو نەخۆشییە بە سێ دەستە دابەش دەکرێ:

**١- هەو بە هۆی میکرۆبەوە؛** ئەم حاڵەتە کتوپڕ و لەنەکاو دەست پێدەکات و زیاتر لە پیاوانی گەنجدا دەبیندرێ. نیشانەکانی ئەمانەن:

تا و لەرز،

بێحاڵیی و ئێشی جومگەکان،

پشت ئێشە،

زوو زوو میز کردن (نەخۆش هەست بە میزهاتن دەکات، بەڵام میزێکی کەم دەکات)،

ئێشی کۆم،

ئێش لە کاتی میزکردندا، یان لە کاتی تەواوبوونی( جووت بوون) سێکسدا،

**دەرمان.** کەڵک وەرگرتن لە ئانتیبیۆتیک وەکو باکتریم[١٨٦]، نۆرۆکسین[١٨٧]، سیپرۆفلۆکساسین[١٨٨] ، ئەویش بۆ ماوەی ٧ هەتا ١٤ رۆژ.

**٢- هەوی درێژخایەنی پرۆستات بە هۆی میکرۆبەوە؛** نەخۆشییەکە وردە وردە دەست پێدەکات و ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ. نیشانەکانی ئەمانەن:

هەوی زوو بە زووی دەستگای میز و زاوزێ،

ئێشی کۆم،

ئێشی ناوچە جنسییەکان،

186 Bactrim
187 Noroxin
188 Ciprofloxacin

پشت ئێشە،
ناراحەتیی لە کاتی میزکردندا،
هەبوونی خوێن لە ئاوی پیاودا.
**دەرمان**. کەڵک وەرگرتن لە ئانتیبیۆتیک بە ماوەی ١٦ هەفتە.
**٣- هەوی نامیکرۆبیی درێژخایەنی پرۆستات** لە جۆرەکانیتر باوترە. هۆیەکەی هێشتاکە نەناسراوە. لە بەراورد لەتەک جۆرەکانیتردا، هەشت جار پتر دەبیندرێ. نیشانەکانیشی هەر وەکو هۆی درێژخایەنی
میکرۆبییە. بەو جیاوازیەوەی کە نیشانەکانی چڵککردنی دەزگای میزـ زاوزێ لەواندا سەرهەڵنادات. بۆ دەرمانی ئەم حاڵەتە لە دەواگەلی دژەهەوی ناسترۆئیدیی کەڵک وەردەگیرێ. بەو کەسانەی کە تووشی ئەم نەخۆشییە بوون پێشنیار دەکرێ خاڵەکانی خوارەوە رەچاو بکەن:
دانیشتن لە ئاوی گەرمدا،
سێکسکردنی بەبەرنامەو رێک و پێک،
وەرزشی سووک،
نەخواردنی خواردەمەنی تیژ و پڕ لەکافائیین،
نەخواردنەوەی ئەڵکۆڵ.

## گەورەبوونی ناشێرپەنجەیی پرۆستات[189]

گەورەبوونی ناشێرپەنجەیی پرۆستات لە زۆربەی پیاوان‌دا پاش تەمەنی پەنجا ساڵیی دەبیندرێ، بەڵام لە تەمەنی ٣٠ ساڵەیشدا بینراوە. گۆڕانی پێکهاتەی پرۆستات لە چل ساڵییدا دەست پێدەکات. لە زۆربەی پیاوان، لە تەمەنی ٧٠ ساڵییدا پرۆستات گەورە دەبێ. سەرەڕای ئەوەیکە پسپۆڕان پەرەگرتنی ئەم نەخۆشییە لە پێوەندیی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی هۆرمۆنیی

189 Benign Prostatic Hyperplasia - BPH

پیاوان به پێی چوونەسەرەوەی تەمەن دەزانن، بەڵام هۆی سەرەکیی ئەم نەخۆشییەیە جارێ بە تەواویی نەناسراوە، بەم پێیە پزیشکەکان توانایی پێشگیرییان نییە لە پەرەگرتنی ئەم رەوتە.




دەرمان یان نەشتەرگەریی لە پێوەندیی لەگەڵ گەورەبوونی پرۆستات بە تەنگبوونەوەی میزڕێ و مانەوەی بەشێک لە میز لەمیزەڵداندایە.

**نیشانەکان:**

درەنگی لە دەستپێکی میزدا،

زۆر بۆ خۆهێنان بۆ راماڵینی میز،

مانەوەی بەشێک لە میز لە میزەڵداندا،

زوو زوو میز کردن و هەست بە پڕبوونی میزەڵدان کردن،

کەمبوونەوەی فشار و پچڕپچڕ میزکردن،

شەو هەستان بۆ میزکردن،

هەبوونی خوێن لە میزدا،

خورین و سووتانەوە لە کاتی میزکردن بە هۆی چڵکی میزڵدانەوە.

**چارەسەریی:** دەرمانی نەخۆش بە پێی تەمەن و سەرهەڵدانی نیشانەکان لە چاودێری و کۆنترۆڵی نەخۆشەوە هەتا نەشتەرگەریی لە نەوەساندایە. لە کاتی کەم بوونی نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە پێویست بە دەرمانی تایبەتیی ناکات و پێشنیار دەکرێ ئەم کەسانە لە ژێر چاودێری پزیشک بن و لە خواردنەوەی ئەلکۆل، هەروەها زۆرخواردنەوەی ئاو پێش خەوتن پارێزبکەن.

**شێرپەنجەی پرۆستات:**




ئەم شێرپەنجەیە دووهەمین شێرپەنجەی باو و دووهەمین هۆی مردنی پیاوانە لە ئەمریکا. شێرپەنجەی پرۆستات لە سەتا پەنجای پیاوانی سەرەوەی ٧٠ساڵ و لە نێزیکەی تەواوی پیاوانی ٩٠ ساڵدا دەبیندرێ. هۆی ئەم شێرپەنجەیەش هێشتاکە نەناسراوە.

لێکۆڵینەوەکان پیشانیانداوە کە شێرپەنجەی پرۆستات لەو پیاوانەدا زۆرترە کە گرووپی خوێنی « O » یان هەیە. بەڵام لە نێو ژاپۆنییەکاندا کەمتر دەبیندرێ و رەش پێستان زۆرتر لە سپی پێستان توووشی ئەم حاڵەتە دەبن. هەندێک لە تۆێژەران پێوەندیی خواردنی رۆنی ئاژەڵ و شێرپەنجەی پرۆستاتیان پیشانداوە. خواردنی ڤیتامین A بواری تووشبوونی شێرپەنجەی پرۆستات کەمتر دەکاتەوە،( رۆنی ئاژەڵ پڕە لە ڤیتامین A) . رەنگبێ چوونەسەرەوەی

هۆرمۆنی پیاوانه(تێستۆستێرۆن)، یەکێک لە هۆکارەکانی شێرپەنجەی پرۆستات بێ.

**نیشانەکان**: لە دەستپێکدا بە هۆی پەرەگرتنی ئارام و سووکی نەخۆشییەکە نیشانەیەکی تایبەتی نابیندرێ، بەڵام لە کاتی پەرەگرتوویی ئەم نەخۆشییەدا گەورەبوونی پرۆستات، هەروەها ئێشی ئێسکەکان دەبیندرێ. کۆنترۆڵ کردنی پرۆستات، بە تایبەتیی پاش تەمەنی چل ساڵیدا رۆڵێکی بەرچاویی لە دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە هەیە. لە پیاوانی ٤٠ تا ٥٠ ساڵدا ، ساڵێ جارێک تێروانینی پرۆستات لە رێگای ریخۆڵەی راستەوە و ئەندازەگرتنی ماددەیەک لە خوێندا بە نێوی **PSA** کە تایبەتە بۆ شێرپەنجەی پرۆستات، رۆلێکی بەر چاوی لە ناسینی ئەو شێرپەنجەیەدا هەیە. PSA کورتکراوێی Prostate Specific Antigen (دژەلەشی تایبەتمەندی پرۆستات) ـ ە و لە کاتی شێرپەنجەی پرۆستاتدا ئاستی PSA لە خوێندا دەچێتەسەرێ. ئاستی PSA بە پێی تەمەنی پیاو بەم چەشنەیە:

لە پیاوانی ٥٠ هەتا ٥٤ ساڵدا ٧ .٣ میلیمەتر/نانۆگرەم[١٩٠]

لە پیاوانی ٥٥ هەتا ٥٩ ساڵدا ٤ میلیمەتر/نانۆگرەم

لە پیاوانی ٦٠ هەتا ٦٤ ساڵدا ٤. ٥ میلیمەتر/نانۆگرەم

لە پیاوانی ٦٥ هەتا ٦٩ ساڵدا ٢. ٦ میلیمەتر/نانۆگرەم

لە پیاوانی ٧٠ هەتا ٧٤ ساڵدا ٦.٦ میلیمەتر/نانۆگرەم

گەیشتنی میزانی PSA لە خوێندا بە ١٠ میلیمەتر/نانۆگرەم یەکێک لە نیشانە سەرەکییەکانی شێرپەنجەی پرۆستاتە. یەکێتی ئۆرۆلۆژەکانی ئەمریکا پێشنیار دەکەن تا رادەی PSA ی پیاوان پاش تەمەنی ٥٠

190 Nanogram/milliliter

ساڵیدا جارێک لە ساڵ و لەوانەی کە لە بنەماڵەیاندا ئەم نەخۆشییە باو بووە پاش تەمەنی ٤٠ ساڵی ئەندازە بگیرێ.

شێوەی دەرمانی ئەم نەخۆشانە بەپێی قۆناغی پەرەگرتوویی شێرپەنجەیە و لەم رەوتەدا لە تیشک درمانیی، بە کارهێنانی هۆرمۆنی ئسترۆژێن یاخود نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

## سەرچاوەکان

HARRISN’S 15 th Edition, Principles of Internal Medicine 2001

THE MERCK MANUAL OF MEDICAL INFORMATION 1997

Lecture Notes on Urology, John Blandy 1982 -

Onkologie 2000

Internal Medicine ,book 4,Robert A .Hannaman,MD,Tenth Edition ٢٠٠٤ /٢٠٠٣

Praxisleitfaden Allgemeinmedizin,St.Gesenhues R.Yiesche 2001

Hexal MEMO Med.2 Auflage ,Sönke Müller 2002 -

٥-Treatment Guidelines for Medicine and Primary Care, Paul D.Chan ،MD & Margaret T.Johnson,MD. 2002 Edition

Color atlas and text of clinical medicineForbes&Jackson,2-d Edition ١٩٩٧

Mosby’s Diagnostic and Laboratory Test Reference,Fifth Edition ٢٠٠١

Treatment of Prostatitis, Jmaes. j and ….,American Academy of Family Physicians,2000

Prostatitis,By Sean O Henderson ,MD ,2002 -

التهاب پروستات بيمارى مردها . تيلتينسكى و ... مينسك ١٩٩٨(روسى )

اورولوژى براى پزشك خانواده ، پروفسور ساوچنكو . مينسك ٢٠٠٠(روسى )

درمان هيپرپلازى خوش خيم پروستات ترجمه دكتربهزاد دره التاج

# پێویستیی و گرنگیی
# بارهێنانی جنسیی منداڵان




به داخەوە زۆربەی خەڵک نایانەوێ یا ناتوانن و پێیان عەیبێکی گەورەیە وەڵامی ساکارترین پرسیاری منداڵەکانیان سەبارەت بە سێکس بدەنەوە. جەماعەتێک وشەی سێکس وەک سنوورێکی مەزن لەبەرچاو دەگرن کە تێپەڕین لێی دەبێتەهۆی کرانەوەی پێش وەختی چاو و گوێچکەی منداڵان و شکاندنی سنووری شەرم و حەیا. بەشێکیش تەنانەت ئەگەر پێشیان خۆش بێ وەڵامی منداڵان بدەنەوە، لەبەر نەبوونی زانستی پێویست سەبارەت بەم مەسەلەیە، دادەمێنن و ناتوانن بە شێوەیەکی رێک و پێک لە چۆنیەتیی جیهانی سێکس و سێکسوالیتە بدوێن. ئەم گرفتە لە دەرەوەی وڵاتیش نە تەنیا لە نێوان کوردەکان و کۆچەرانیتردا دەبیندرێ، تەنانەت، زۆربەی خەلکی رۆژئاواش مەیلێکی وایان نییە کە لە سەر ئەم مەسەلەیە لەگەڵ منداڵەکانیان بە شێوەیەکی ئاسایی بدوێن. ئەمەش لە حالێکدایە کە پێمان خۆش بێ یان نا، لە دونیایەکی سێکسییدا دەژیین، لە جیهانێک کە رۆژانە بە چەشنێک سەر و کارمان لەگەڵ دونیای سەرسوڕهێنەری سێکس هەیە، لە رادیۆ و تەلەڤزیۆن، ئێنتەرنێت، رۆژنامە و گۆڤارەکان، موسیقا و تەنانەت لە

پرۆپاگەندەی حیزبە سیاسییەکانی رۆژئاوایش هەر باسی دەکری و بۆ فرۆشتنی زۆر شت لە سابوونەوە بگرە هەتا ئۆتۆمبێل لە سێکس و وێنەی ژنی رووت و جوان کەڵک وەردەگرن. تەنانەت پێشەوایانی ئایینیش لە ریساڵەکانیان زۆر گێرانەوە و رەوایەت و قسەی خۆشیان سەبارەت بەجێگای شەرمگای ژن و پیاو هەیە،هەر چەند خوداوەندی عالەم سێکسی لە پێشەوایانی عیسایی و راهبە دونیاتاریکەکان حەرام کردووە، ئەوانیش هیچ کاتێک بە فیرۆ نادەن و بە نهێنی یا ئاشکرا خەریکی ئەم کارە پیرۆزەن و جار و بار ئاکاری سێکسیی ئەوان لەگەڵ منداڵان و قوتابییەکانیان بە مانگ خۆراکی بەرنامەکانی تەلەڤزیۆن و ریپۆرتاژی رۆژنامە و گۆڤارەکانە.

بەڵام بە پێی ئەو شتانەی کە باسمان کردن، ئایا منداڵان وەڵامی پرسیاری خۆیان سەبارەت بەسێکس و چۆنیەتی هەستی جنسیی بە درووستی و رێک و پێکی وەردەگرنەوە؟ ئایا بێ دەنگیی، یا وەڵام نەدانەوەی دایک و باوک بەو پرسیارە ئاساییەی منداڵان، هانیان نادا پەنا بە جەماعەتی بێگانە ببەن؟ ئایا هەر ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە بەشێک لە منداڵان تووشی سێکسی پێش وەخت، نەخۆشیی جنسیی وەک سیفلیس، سووزەنەک، ئیدز ببن؟ ئایا ئەمە نابێتە هۆی مەترسیی زگپڕیی کچە قوتابییەکان و تێک چوونی ژیان و داهاتووی ئەوان و مناڵەکەیان؟

بە پێی سەرژمێرییەک، لە سەتا ٧٢ی کوڕان و ٦٦ی کچانی ئەمریکیی بۆ هەوەڵ جار نەک لە لایەن دایک و باوکیان، بەڵکو جەماعەتێکیترەوە شارەزای چۆنیەتیی ژیانی جنسیی دەبن و تەنیا لە سەتا ١٠ی ئەوان لە قوتابخانە بە شێوەیەکی درووست فێری زانستی سێکس و تایبەتمەندییەکانی ئەندامە جنسییەکانی جەستەی خۆیان دەبن! لە راگەیاندنێکی گروپی میانەڕەوی پەڕلەمانی بەریتانیا باسی مەترسیی ژیانی جنسیی مناڵانی ئەم وڵاتە وەک ئاکامی بێدەنگی و نەتوانینی دایک و باوکەکان بۆ شیکردنەوە و باسکردنی پێوەندیی و تەندروستیی جێنسیی

دەکرێ. بە پێی راپۆرتی کۆمیتەی تەندروستیی بەریتانیا، زۆرترین ئاستی زگپڕی کچانی لاوی رۆژئاوایی لەم وڵاتەدا دەبیندرێ.

لە راستییدا، ئێمە لە وڵاتێکدا لە دایک بووین کە باسی ژیان و چۆنیەتیی مەیل و ئاکاری جنسیی وەک گوناحێکی مەزن لە قەلەم دەدرێ، تەنانەت دایک و باوکانیش بیانەوێ باسی بکەن لەبەر ناشارەزایی لە زانستی کاری جەستەی مرۆڤ و سێکس و سێکسوالیتە، و نەبوونی کولتوری وتووێژ لەگەڵ منداڵان، لە وەڵام دانەوەدا دۆش دادەمێنن، چۆن رۆشنبیری کورد دەتوانێ تا ئەم پێستە ئەستوورە نەدڕێنێ و پەنا بە خوێندن و زانین و گۆڕینی بەشێک لە داب و نەریتی کۆن نەبا، ئەرکی گرنگی بارهێنانی جێنسیی منداڵەکەی بەجێ بێنێ؟!

لە ژیانی رۆژانەدا، ئەو کاتەی کە منداڵ پرسیارێک سەبارەت بە مەسەلەی جنسیی لە دایک و باوکی دەکا، لە پلەی هەوەڵدا یەکێک لە حاڵەتەکانی ژێرەوە دێتە پێش:

**پەشێویی**. مرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە کە وەڵامی ئەم پرسیارە چ کاریگەرییەکی لە سەر منداڵ دەبێ.

**بێمتمانەیی بە خۆ**. ئەگەر وەڵامەکەم درووست و رێک و پێک نەبێ چ دەقەومێ؟

**رامان**. ئایا کاتی ئەوە گەیشتووە باسی سێکس لەگەڵ منداڵ بکرێ؟

ئەم پرسیارانە زۆر بەجێ و درووستن، بەڵام منداڵ کە پرسیارێک دەکا چاوەڕوانی وەڵامە. شێوەی هەڵسوکەوتی درووستی دایک و باوک بۆ شیکردنەوەی پرسیار و ویستی منداڵ دەتوانێ ببێتە هۆی خاڵەکانی خوارەوە:

**i)** منداڵ دەبینێ جێی سەرنجی دایک و باوکێتی و ئەوان هەمیشە ئامادەی گوێ راگرتنن لە پرسیارەکانی و دانەوەی وەڵامێکی شیاو.

j) پێویست ناکا بۆ وەرگرتنی وەڵامی خۆیان روو لە بێگانە یا جەماعەتی نالەبار بکەن.

k) لە لای منداڵ رێز و حورمەتی دایک و باوک زۆرتر دەبێ و دەبێتە هۆی متمانە وهەستی نزیکی زۆرتر بەوان.

l) تا رادەیەکی زۆر بەرگریی لەشوێن کەوتنی منداڵە داوی کەرەستەی سرکەر، سێکسی پێشوەخت، زگپڕیی کچان و نەخۆشییەکانی جنسیی دەکا. دەبێ ئەم مەسەلەیە لەبەرچاو بگیرێ کە بۆ وێنە لە سەتا ٥٣ی لاوانی ئەمریکی پیش تەواوکردنی قوتابخانە، ئەزموونی پێوەندیی جێنسییان هەیە و ساڵانە نزیک بە ٣ میلیۆن لاو تووشی یەکێک لە نەخۆشییەکانی جنسیی دەبن. بە پێی سەرژمێرییەک سێ لەسەر چۆاری گەنجەکانی ئەمریکا لە تەمەنی ١٨ تا ١٩ ساڵیدا پیوەندیی جێنسییان لەگەڵ هاورەگەز یا رەگەزی بەرانبەر بووە. لە نێو هاوجنس بازەکاندا بە واتەیەک پیوەندیی جنسی زووتر و لە تەمەنی ١٦-١٣ ساڵاندا دەست پێدەکا. بە پێی ئەو خاڵانەی کە باسکرا کردنەوەی بابەتی وتوێژ سەبارەت بە ژیانی جنسیی ئەگەر درەنگ نەبووبێ قەت زوو نییە!

## پرسیارە گشتییەکان سەبارەت بەسێکسوالیتە[191]

چەمک و مانای سێکسوالیتە زۆر بەربلاوترە لە هەست و نزیکایەتی جنسییە و رۆلێکی گرنگ لە سەر ژیانی مرۆڤ، شێوەی هەستکردن بە چۆنیەتیی ژیان و راستییەکانی دەوروبەر، ناسین و رێز بۆ خۆ و ماڵ و منال، مانای ئەوین و دلداریی، خۆشیی و ناڕەحەتیی، هەروەها هاودەردیی و دلسۆزیی و هتد ... دەگێڕێ.

191 Sexuality

سێکسـوالیته بەشـێکه لـه سروشـت و کەسـایەتی مـرۆڤ. مـرۆڤ بوونەوەرێکی جنسییە(سێکسواله) و ئەم حاڵەته بریتییە له:

جەسـتەی مـرۆڤ و چـۆنیەتیی کـاری جەسـته، وەک: جیـاوازیی کـاری جەستەی ژن و پیاو، ئەندامەکانی جنسیی، زاوزێ.

جنسـیەت، ژن یـا پیـاو بـوون. چـۆنیەتیی کـار و رۆڵـی هـەر کامیـان لـه کۆمەڵگادا، جیاوازیی کار و جل و بەرگیان.

هەستی جنسیی. مەیلی جنسیی به هاورەگەز(هێمۆسکسواڵ)، به رەگـەزی بەرانبەر(هێترۆسکسواڵ)، یا به هەر دوو( بایسکسواڵ).

رێزگرتن و بایەخدان به ژیانی ئەو کەسانەی که لەگەڵی له پێوەندییدان.

هەست و تێگەیشتنی مرۆڤ له جوانیی.

کاتێک منـاڵ به تەمـەنی باڵغبوون دەگـا، هەسـت و مـەیلی جنسـیی لـەودا بـەهێزتر دەبـێ. بـه تایبـەتیی لـەم قۆناغـەدا، ئـەرکی دایـک و باوکـه کـه بـه شـێوەیەکی شـیاو و ئاسـایی باسـی ئـەوین و دڵـداریی، یـەکێتیی و جیـاوازیی ئەم هەسته لەگەڵ مـەیل بـه پێوەندیی و نزیکایـەتی جنسـیی بکـەن. بۆ منداڵ دەبـێ روون کرێتـەوه کـه" ئـەوین و خۆشـەویسـتیی" هەسـتێکی بـه هێـز و مرۆییه که دەتوانێ له خۆشەویستیی و رێزی مـرۆڤ بـه کـچ، کـوڕ، بنەماڵـه، دۆست، وڵات، حیزب، بیر و باوەڕ و مرۆڤدا خۆی بنوێنێ تـا ئـەو رادەیـه کـه ئامـادەیٚ چاوپۆشـیی دڵـخـواز و هەسـتپێکراو و ئاکـارێکی تایبەتمەنـد لـه رێ ئەودا بـێ. زۆر جـار چیـرۆک و شـیعر و شـێوەی ئاشـنایی لەگەڵ راستـییەکانی ژیـان ئـەتوانێ رۆڵێکی بـەرچاو لـه بزاوتنـی هەسـتی ناسـکی مرۆڤدا بگێڕێ.

بۆ منداڵ دەبێ روون کرێتـەوه کـه ئـەوینی جنسیی، مـەیلو ویسـتێکی بـه هێز و ئاساییە، که جاروبـار گـەلێک رۆئیـایی، خـەیاڵی، شـەیدایی یـان تـەنیا لەنجـه و نـازێکی سـاکاره. هەسـتی جنسـیی دەتـوانێ بـی هـەر چەشـنه پێوەندییەک لەگەڵ هەستی ئەوین و دڵداریی سـەرهەڵدا، ئـەوین و دڵداریش

بێ ویستی جنسیی دەست پێ بکا. ئەوانەی‌کە لە ژیانی هاوبەشدا هەر دوو هەستەکەیان بە یەکەوە هەیە، لە ژیانیان کەڵک و خۆشیی‌یەکی زۆرتریان دەبێ تا ئەوانەی‌کە بێ بەش لە یەکێک لەو هەستانەن.

لە تەمەنی باڵغبووندا بە پێی گۆڕانی هۆرمۆنەکانی جەستە،هەستێکی بە هێزی جنسیی لە منداڵاندا بە کەسانی دوور و نزیک وەکو: خوشک و برای دۆستەکانیان، مامۆستای مەدرەسە و هتد ... سەر هەڵدەدا. لەم پلەیەدا دایک و باوک نابێ چاو ڕەوانی پرسیاری منداڵ بن، باشتر ئەوەیە بە پێی تەمەن و ڕادەی ویستی ڕۆحیی و ئاسایی منداڵ و بە کەڵک وەرگرتن لە ڕووداوەکانی ڕۆژانە پرسیارێک درووست بکەن و ڕاوێژی لەسەر بکەن. بەڵام دەستکەوتی ئەم کارە کاتێک ڕەنگێکی ئەرێنیی دەداتەوە کە دایک و باوک شارەزا و ئاگاداری زانستی پێکهاتن و کاری سروشتیی جەستەی منداڵ بە پێی تەمەنی ئەوان بن. ئەمەش پێویستی بە خوێندن و فێر بوون هەیە و هەرچی زووتر هەنگاوی بۆ هەڵێندرێتەوە، قازانجی زورترە و ئاکامی باشترە. بۆ وێنە منداڵ لە تەمەنی ١٠ تا ١٤ ساڵیی‌دا دەبێ ئاگاداری خاڵەکانی خوارەوە بێ:

زاوزێ و ئاڵوگۆڕی پێکهاتە و کاری ئەندامەکان.

دەستدرێژیی و ئازاری جنسیی و شێوەی بەرگریی.

نەخۆشیی‌یەکانی جنسیی.

**کاریگەریی تەلەڤزیۆن وئینتەرنێت لەسەر مناڵ:**

بەرنامەکانی تەلەڤزیۆن کە لە چوارچێوەی تەمەنی منداڵاندا نین کارتێکەریی‌یەکی خراپیان لە سەر ژیان و ئاکاری ئەواندا هەیە. زۆربەی فیلمەکانی تەلەڤزیۆن بە نیشاندانی پێوەندیی جنسیی ژن و پیاو، بیری مناڵ بە شێوەیەکی نائاسایی بەرەو بابەتگەلێک دەکێشن کەهیچ چەشنە هاوتایی لەگەڵ ویست و هەستی ڕۆحیی و سروشتیی ئەواندا نی‌یە. بەپێی

لێکدانەوەی Kaiser Family Foundation لە فیلمەکانی پڕبینەری تەلەڤزیۆندا بەلایەنیکەم ٨ جار پێوەندیی جێنسیی نیشان دەدرێ کە دوو لە سەر سێی راستەوخۆ نزیکایەتی جنسیی ژن و پیاوە. منداڵان بە دیتنی ئەم فیلمانە لە ژیان و راستییەکانی جیهانی منداڵیان دوور دەخرێنەوە و بەجێی دەرس، وەرزش، کایە لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەن و یاری لە ماڵێ، زۆربەی کاتی بە کەڵکیان بەداخەوە بە فیرۆ دەڕوا. بۆ وێنە لە ئەمریکا، منداڵان لە حەوتوویکدا بەلانی کەم ٢٤ کاتژمێر سەیری تەلەڤزیۆن دەکەن. بە پێی سەرژمێرییەک، منداڵێکی ئەمریکیی لەو کاتەوە کە دەچێتە باخچەی منالان تا ئەو کاتەی کە پۆلی ١٢ تەواو دەکا، نزیک بە ١٨هەزار کاتژمێری بە سەیری تەلەڤزیۆن تێپەڕ دەبێ و تەنیا ١٣ هەزار کاتژمێر چۆتە قوتابخانە. جیاوازیی ئەم ژمارەیە لە ولاتیکی وەک ئاڵمانیا کە کاتژمێری چوونە قوتابخانەی منالان تا پۆلی ٦ کەمتر لە ئەمریکایە، دەبێ زۆرتربێ. بۆ پێشگیریی لە ئاکامی نەرێنیی تەلەڤزیۆن لە سەر منداڵان، پێشنیار دەکرێ کاتی سەیری تەلەڤزیۆن کەمکرێتەوە و پێشگیریی لە سەیری ئەو فیلمانە بکرێ کە لەگەڵ تەمەنی منداڵدا یەک ناگرێتەوە. باشترە تلەویزیۆن لە دیوی دانیشتن بێ و منداڵ لە دیوی خۆی تەلەڤزیۆنی لەبەر دەست نەبێ. بەرتەسک کردنی سەیری تەلەڤزیۆن دەرفەتێکی زۆرتر بە منداڵ دەدا تا لە کاتی خۆی کەڵکێکی باشتر وەرگرێ، کاتی پشوودانی لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەن و بنەماڵە بە شێوەیەکی ئاسایی و باشتر تێپەڕ بێ.

لە جیهانی پێشکەوتووی ئەمڕۆدا، ئینتەرنێت بە هێزترین، خێراترین و بەرچاوترین سەرچاوەی راگەیاندنی هەواڵ، پێوەندییگرتن و بەدەست هێنانی بەرهەمەکانی ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، فەرهەنگیی و زانستییە. تا ساڵی ٢٠٠٣ زۆرتر لە٤٥٠ میلیۆن کەس لە چوار گۆشەی دونیا دەستیان گەیشتۆتە بە ئینتەرنێت بووە و بە پێی پێش بینییەک دەبێ ئەم رەقەمە لە ساڵی ٢٠٠٥ دا بە بیلیۆنێک گەیشتبێ. لە ماوەی ساڵانی ١٩٩٨

تا ٢٠٠٣ ژمارەی بینەرانی ئەڵمانی ئینتەرنێت تا ٧ قات زۆرتر بووە و تەنیا لە ساڵی ٢٠٠١ دا نزیک بە ١٠ ملیۆن ئەڵمانی پێوەندیی‌یان بە یەکێک لە کۆمپانیی‌یەکانی ئینتەرنێتەوە کردووە. ئینتەرنێت هەر بەو شێوەی کە دەتوانێ سەرچاوێکی بە کەڵک و باش بێ، دەشتوانێ سەرچاوەی تاڵیی، ناخۆشیی و تەنانەت کارەساتی گەورە لە بنەماڵەگەلێک بێ کە منداڵان بێ کۆنترۆڵی شیاوی دایک و باوک کار بە ئینتەرنێت دەکەن و زۆربەی کاتی خۆیان لە لاپەڕەی دەمەتەقێ[192]، کایە و سەیری سایتەکان تێپەڕدەکەن. ئەوەندەی کە منداڵ لە بەشی گەڕانی ئینتەرنێت[193] وشەی سێکس بنووسێ، ڕێگای بە هەزاران سایتی جۆراوجۆری سێکسیی دەکرێتەوە. بۆ وێنە تەنیا لە AOL. com پتر لە ٢,٧٤٠,٠٠١ لاپەڕەی ئینتەرنێتی هەیە، کە لە هەر لاپەڕەیەکدا ١٥ سایتی سێکسیی تێدایە. بێجگە لەوەش، لاپەڕە(پەیجی) دەمەتەقێ(چات) بۆتە جێی لە داو خستنی منداڵان لە لایەن منالبازەکانەوە. بۆ وێنە لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٩٣ تا ١٩٩٩دا، ئێف. بی. ئای ئەمریکا ١٧٩ کەسی گرتووە کە لە ڕێگای لاپەڕەی چاتەوە منداڵانیان خستۆتە داوی خۆیان و دەستدرێژیی جنسیی‌یان لێ کردون، بو سازکردنی فیلمە پۆرنۆگرافیی‌یەکان کەڵکیان لێ وەرگرتوون و دەیان بەڵای‌تریان بەسەر هێناون. باشتر ئەوەیە بۆ بەرگریی لەهەر چەشنە کارەساتی گەورە و بچووک، منداڵان لە ژێر چاودێریی و کۆنترۆڵی دایک و باوکیان کەڵکی شیاو لە ئینتەرنێت وەرگرن.

192 Chat
193 Search the web

## دەسدرێژیی جنسی لە منداڵ:





دەسدرێژیی جنسیی لە منالاّن یەکێک لەو بابەتانەیە کە ژیان و داهاتووی منداڵان دەخاتە مەترسییەوە. بە داخەوە دەسدرێژیی جێنسیی شتێکی نوێ نیيە و مێژوویەکی بە درێژایی مێژووی مرۆڤ لە دونیای زۆر کۆنەوە هەتا ئیستای هەیە.

دەسدرێژیی جنسیی لە تەواوی وڵاتانی دونیادا سەرەڕای جیاوازیی فەرهەنگیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی بە شێوەیەکی بەرچاو خۆی دەنوێنێ و تەنیا جیاوازیی لە شێوەی بۆچوونی بنەماڵە، کۆمەڵگا و یاسای سزادانی ئەو وڵاتە سەبارەت بەم مەسەلەیەیە. تەنانەت لە زۆربەی وڵاتانی پێشکەوتووش تا نێوەڕاستی ساڵەکانی ٧٠ی زایینی، بە شێوەیەکی جیددی و یاسایی سەرنجی لێ نەدراوە، لە وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقاییشدا کە شێوەی ژیانی فیودالیی- ئایینیی زاڵە، نە تەنیا سەرنجی جیددیان نەداوەتە ئەم مەسەلەیە، تەنانەت زۆر جاریش بە بۆنەی بەرگریی لە شەرەفی بنەماڵە و داپۆشینی ئەم ئاکارە، مناڵەکەیان زۆر بێڕەحمانە کوشتووە.

لە ئەمریکا تا ساڵی ١٩٧٥ بە شێوەیەکی جیددی و ئاسایی بەرگریی لەو مەسەلەیە نەکراوە. بە پێی لێکۆڵینەوەی "کومیتەی نەتەوەیی پێشگیریی لە

دەسدرێژیی جنسیی منالانی ئەمریکا" لە سالی ١٩٨٢، سالانە نزیک بە یەک میلیۆن منداڵی ئەمریکایی دەسدرێژیی جنسیی‌یان لێکراوە، یا ئازاری جەستەیی دراون. بە پێی سەرژمێرییەکی‌تر، سالانە دەسدرێژیی جنسیی لە٢٠٠ هەزار منداڵی ئەمریکایی دەکرێ، یا بە شێوەیەک ئازار دەدرێن. کچان قوربانیی سەرەکیی دەسدرێژیی جنسیین، لە ئەمریکادا لە سەتا ٢٧ی کچان و ١٦لەسەدی کوڕانی ژێر ١٢ ساڵ؛ و لە ئەڵمانیای رۆژئاوا لە سەتا ١٥ تا ٢٥ی کچان و لە سەتا ٥ تا ١٠ی کوڕان بە جۆرێک دەسدرێژیی جنسیی‌یان لێکراوە. بە پێی لێکۆڵینەوەکانی رێکخراوی بەرگریی لە منداڵانی ئێران، لە سەتا ٥٠ی ئەو منداڵانەی کە ئاوارەی کوچە و کۆڵانانن و وەک " منداڵانی شەقامیی" دەناسرێن، دەسدرێژیی جێنسیی‌یان لێکراوە و تەنیا لە تارانی پایتەختی کۆماری ئیسلامیی ئێران، لە سالی ٢٠٠٣-٢٠٠٢ رێژەی منداڵانی شەقامیی پتر لە ٢٥ هەزار کەس بووە.

لە زۆربەی ئەو کارەساتانەدا لە سەتا ٩٠ی دەسدرێژکەر ئەندامی بنەماڵە، خزم یان دۆست و ئاشنای نزیک بووە. بۆ وێنە لە ئەڵمانیای رۆژئاوادا لە سەتا ٦٠ی دەسدرێژکەر ئەندام و خزمی بنەماڵەیە( لەسەتا ٥٠ی، باوکی منداڵە)، لە سەتا ٣٠ی دۆستی بنەماڵە و جیرانەکانیان و لە سەتا ٦ تا ٧ خەلکی نەناسراو و بێگانە بووە. لە سوید-یش بە پێی راپۆرتی سالانەی رێکخراوەی BRIS، لە سالی ٢٠٠٢ دەسدرێژیی جنسیی لە منالان بە نیسبەتی سالی ٢٠٠١ تا سەدا ٣٠ چۆتەسەرێ، لە هەر ١٠ منداڵ ٨ی لە لایەن باوکیانەوە دەسدرێژیی جنسیی‌یان لێکراوە و ٩ لە١٠ی ئەو کەسانەی دەسدرێژیان لێکراوە کچ بوون.

بە داخەوە زۆر جار ئەم ئاکارە سالیانی ساڵ درێژەی پێدەدرەی و دەسدرێژکەر لە تەواوێ شێوەکان بۆ بێ‌دەنگ راگرتنی منال و پێش‌بردنی ئامانجی خۆی کەلک وەردەگرێ.

**ئەم منداڵانە زۆرتر لە مەترسیی‌دان:**

ئەوانەی کە لە ژێر چاودێر و کۆنترۆڵی شیاوی دایک و باوکدا نین.

ئەوانەی کە دایک و باوکی مەشروب خۆر یا خووگرتوو بەماددەی سڕکەریان هەیە.

ئەو منداڵانەی کە هەستێکی زۆر بە تەنیایی دەکەن و پێویستیی‌یان بە دڵداریی و خۆشەویستیی هەیە.

ئەوانەی کە شارەزا نین بەشێوەکانی دەسدرێژیی جنسیی و بەرگریی لە خۆیان.

**شێوەکانی جۆراوجۆری دەسدرێژیی جنسیی،**

**دەسنیشانکردنی دەسدرێژکەر**

بەهەر ئاکارێک کە ببێتە هۆی نزیکایەتی جنسیی لەگەڵ منداڵ" دەسدرێژیی جنسیی" دەگوترێ وەکو:

نزیکایەتی جنسیی لەگەڵ منداڵ لە ڕێگای دەم، کۆم یا ئەندامی جنسیی ژنانە".

دەستلێدان لە ئەندامی جنسیی، سنگ و سمتی منداڵ.

هەر کار و ئاکارێک کە هۆی ئازاری منداڵ لە بەر جنسیەتی (کوڕ یان کچ بوون) بێ.

زۆربەی منداڵانی دەسدرێژیی لێکراو بە هۆی ترس، هەستی گوناە و شەرم، ناوێرن باسی ئەم ڕووداوە بکەن، سرنج و چاودێریێ دایک و باوک دەتوانێ رۆڵێکی سەرەکیی لە دەسنیشانکردن و بەرگریی لەم مەسەلەیە بێ.

بەشێک لە نیشانەکانی یارمەتی دەر بۆ دەسنیشانکردنی دەسدرێژیی جنسیی یا ناڕەحەتیی رۆحیی- دەروونیی منداڵ بە سەرچاوەی‌ترەوە بەم چەشنەیە:

بێ‌ئیشتیایی یان زۆرخۆریی ناساغ،

گریان و گرۆگرتنی درێژخایەن،
ڕقئەستووریی، گرۆگرتنی بێ بنەما،
گۆڕانی حاڵەتی خەوتن، میز بە خۆداکردنی شەوانە،
خەمۆکیی،
مۆتەکە،
بێ مەیلیی بۆ ڕۆیشتن بۆ شوێنێک یا بۆ لای کەسێکی تایبەتیی،
دووریکردن لە دایک، باوک یا ئەندامێکی بنەماڵە،
ئاکارێکی نائاسایی وەک دەست بۆ ئەندامی جنسیی کەسێکی گەورەتر لە خۆبردن،
پێکهاتنی ویستێکی نائاسایی بەرەو ئەندامی جنسیی مرۆڤ یا ئاژەڵ،
گەڕانەوە بۆ ئاکاری کاتی منداڵی وەک قامک(پەنجە)مژین.

**نیشانەکانی جەستە کە دایک و باوک، یا دوکتوری منداڵ هەستی پێدەکا،** وەکو:
خوێنهاتن لە کۆم یا نێوزێ (ئەندامی جنسیی ژنانە)،
ماسینی ئەندامی جنسیی،
شکایەتکردن لە ئێش و ئازاری ئەندامی جنسیی،
چڵکچۆڕان لە نێوزێ،
بۆنی ناخۆش لە دەوروبەری ئەندامی جنسیی،
دڕانی جل وبەرگی ژێر،
بوونی لەکی پیس لە تونکەی منداڵدا،
نەخۆشیی جنسیی وەک سووزەنەک و هتد ... .
**ئەو منداڵانەی کە دەسدرێژیی جنسییان لێ دەکرێ تووشی گەلێک ناکۆکیی درێژخایەنی ڕۆحیی و دەروونیی دەبن، وەکو:**
هەست بەگوناه و خۆتاوانباریی،

گرفتی رەوشتیی و فێرنەبوون لە قوتابخانەدا،
هێرشی هێستێریایی( وررووژاوی زۆر، خێراهەڵچوون)،
مەشروب خواردنەوە یا خووگرتوویی بە ماددەی سڕکەر،
ناتەوانی لە راگرتنی پێوەندیی و دۆستایەتی لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەن،
دەسدرێژیی لە منداڵانی کەم تەمەنتر لە خۆ،
خۆفرۆشیی،
هەڵاتن لە ماڵێ،
تێکچوونی کەسایەتی.

**شێوەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ منداڵی دەسدرێژیی لێکراو:**

لەکاتی دیتن یا گومان کردن بە دەسدرێژیی جنسیی لە منداڵ، پێشنیار دەکرێ بۆ پێشگیریی لە ئازاری رۆحیی منداڵ، ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگیرێ:

**A.** توورە نەبوون و بەتەواوی لای منداڵ مانەوە،

**B.** متمانە و باوەڕکردن بە وتەکانی منداڵ،

**C.** تاوانبار نەکردنی منداڵ،

**D.** پشتیوانی لە منداڵ، نیشاندانی هەستی خۆشەویستیی خۆ بە منداڵ و هاندانی بۆ روونکردنەوە و باسی ئەم مەسەلەیە لای ئێوە،

**E.** وەدەستهێنانی متمانەی منداڵ. منداڵ دەبی دڵنیا بێ کە دایک و باوک لەهەر حاڵەتێک یار و پشتیوانی ئەون،

**F.** هەڵهێنانی هەنگاوی جیددی بۆ پێشگێریی لە دووپات بوونەوەی ئەم کارە و بەرگریی لە ئازاری رۆحیی و جەستەی منداڵ،

**G.** دڵنیایی لە تەواوبوونی دەسدرێژیی جێنسیی لە منداڵ،

**H.** ئاگادارکردنی پۆلیس و رێکخراوە کۆمەڵایەتیی و حکومییەکان بۆ لێکۆڵینەوە و شوێنکەوتنی مەسەلەکە. باشتر ئەوەیە دایک و باوک راستەوخۆ لەگەڵ دەسدرێژکەر دەستەویەخە نەبن،

I. بردنــی منــداڵ بــۆ لای دوکتــوری منــداڵان، هــەروەها دوکتــوری دەروونناس١٩٤،

J. یــارمەتیی رۆحیــی منــداڵ لــە رەوتــی پشــکنینەکانی پزیشــکیی بــۆ پێشگیریی لە تێکچوونی باری دەروونی مناڵ.

**شێوەکانی پێشگیریی**

K. پێکهێنـانی متمانـە بـەخۆ لـە منـداڵ و پێوەنـدیی‌یەکی دۆسـتانە لەگەڵ ئەو، ئاگادارکردنی منداڵ سـەبارەت بـە دەسـدرێژیی جنسـیی و دەسـدرێژکەر و شــێوەکانی بــەرگریی لــەم کــارە بەتایبــەتیی لــە نێــوان تەمــەنی ٥ تــا ١١ساڵیی‌دا، رۆڵێکی بەرچاویی لە پێشگێریی لەم چەشنە کارەساتە هەیە.

L. مناڵ دەبێ ئاگادارکرێ کە رێژەی ئەم کەسانە کەمن، بەڵام پێویسـتە ئاگای لە شێوەی بەرگریی لـە خـۆی بێ و دایـک و بـاوکی سـەبارەت بەهـەر کارێک کە ببێتە هۆی نارەحەتیی دەروونیی، ئاگادار کا. منداڵ دەبێ بزانێ کـە کەس مافی دەسلێدانی لە ئەندامی جنسیی، کۆم و سنگی ئەویی نی‌یە.

M. دەبێ جیاوازیی پێوەندیی باش وەک لـە بـاوەش گـرتن و مـاچ کـردن لـە کـاتی دیـدار یـا ماڵئـاوایی و پێوەنـدیی خـراپ وەک دەسـت لـە ئەنـدامی جێنسیی‌دان و ئەو خاڵانەی کە پێشـتر باسـمان کـرد، بـۆ منـداڵ شـی‌کرێتەوە. هیچ کاتێک نـابێ منداڵ بـۆ مـاچ نـەدان سـەرکوت کـرێ. منـداڵ دەبـێ ئاگـادار کرێ هـەر کاتێک کە ئاکار و کارێـک ببێتـە هـۆی ئـازاری ئـەو، وشـەی " نـا"، " وامەکە"، " تەواوی کە" بە کار بێنێ.

194 Psycholog

## سەرچاوە بەریتانییەکان:

From Diapers to Dating.By Alyssa Haffner Tartaglione،New York, 1999

Talking about Sex. 1996

The Behavioral Sciences in Psychiartry.

By J.M.Wiener&H.A.Breslin

The AIDS Epidemic-considerations for the 21-st centuray.Anthony S.Fauci MD،Sep.30.1999،the New England Journal of Medicine

HARRISN'S 15 th Edition، Principles of Internal Medicine 2001

CURRENT، Medical Diagnosis & Treatment،39th Edition،Edited by Lawrence M.Tierney،Jr and….

Child Sexual Abuse،American Academy of Pediatrics، 1985

www،aol.com ( search Sex)

## سەرچاوە ئاڵمانییەکان:

Deutschland.Nr.4/2002

Amerika Woche ،Nr.37/2002

HIV-Erkrankung،AIDS und Assoziierte Erkkrankung.H.Jabloski

Infektionsprophylaxe bei der Pflege und Betreuung von Patienten mit HIV und AIDS in der intensivepflege.

## سەرچاوەی فارسیی:

انگلستان در بحران سلامت جنسی به سر می برد. 2003;326،BMJ June14 به نقل از

/http://www.hmdj.org

# ئەنفلۆنزای بەراز

ئەنفلۆنزای بەراز[195] نەخۆشییەکی گیرۆی کۆئەندامی هەناسەی بەرازە. هۆی ئەم نەخۆشییە ڤایرۆسی ئەنفلۆنزای بەراز لەچەشنی ئەی- یە[196]. لە حاڵەتی ئاساییدا ئەم نەخۆشییە تایبەتمەندی بەرازە، بەڵام بە هۆی گۆڕانی (مۆتاسیۆنی) ئەم ڤایرۆسە، دەتوانێ ببیتە هۆی نەخۆش کەوتنی مرۆڤ و لە ڕێگای هەناسەوە (کۆخە و پشمین) لە مرۆڤ بە مرۆڤ بدرێ. لەوەدەچێ دەست لە دەم و لوتدان پاش پێوەندیی لەگەڵ شتێک کە ئەم ڤایرۆسەی لەسەربێ دەتوانی هۆی ڕاگواستنی ئەم نەخۆشییە بێ. نەخۆش دەتوانێ لەیەک ڕۆژ پێش سەرهەڵدانی نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە تا ٧ ڕۆژ دوای سەرهەڵدانی، سەرچاوەی ڕاگواستنی ئەم نەخۆشییە بە کەسانیتر بێ.

**سەرنج**: مرۆڤ لە ڕێگای خواردنی گۆشت یان کالباس و هتد ... بەراز تووشی ئەم نەخۆشییە نابێت. ئەم ڤایرۆسە لە کاتی کوڵین بە گەرمای ١٦٠ فارنهایت یان ٧٠ پلەی سلسیووس دەکوژرێ.

نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە وەکو نەخۆشییەکانیتری ئەنفلۆنزای مرۆڤە و بریتین لە:

m) یاو،
n) کۆخە،
o) گەرو ئێشە،
p) پشووسواریی،
q) بێئیشتیهایی،
r) ئازار جەستە و سەرئێشە،

195 Swine flu
196 Influenza A «H1N1»virus

s) لەرز،
t) بێ حاڵیی و هەست بەماندوویی کردن،
u) لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا: دڵتێکەڵاتن، رشانەوە و زگەشۆرە.

**بۆ پێشگیریی لە بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشیی‌یە پێشنیار دەکرێ:**

لە کاتی کۆخە و پشمیندا دەم و لوتتان بە دەستمال هەڵبەستن.

دەستەکانتان بە ئاوی گەرم و سابوون، بە تایبەتیی دوای کۆخە و پشمین بشۆن و پاکی راگرن.

لە دەست لێدان لە چاو، دەم و لوت خۆ بپارێزن.

لەباری فیزیکیی‌یەوە چالاک بن و خۆتان لە سترێس دوور راگرن.

ئاو زۆر بخۆنەوە و لە دەست لێدان لە هەر چەشنە شتێک کە گیرۆدەی ئەم ڤایرۆسە بێ خۆ بپارێزن.

خۆ لەو کەسانەی کە تووشی ئەم نەخۆشیی‌یە بوون دوور کەنەوە و هیچ چەشنە پێوەندیی‌یەکتان لەگەڵ ئەوان نەبێ.

**دەرمان:**

بۆ دەرمانی ئەم نەخۆشیی‌یە لە دەواکانی دژەڤایرۆس وەکو (Oseltamivir (Relenza و (Zanamivir(Tamiflu کەڵک وەردەگیرێ. بۆ پێشگیریی لەم نەخۆشیی‌یە هیچ واکسینێک نی‌یە. ئەم نەخۆشیی‌یە دەتوانێ ببێتە هۆی مردنی نەخۆش.

**سەرچاوەکان:**


13. http://www.who.int/csr/swine_flu/swine_flu_faq_26april.pdf
14. http://www.nlm.nih.gov/medlineplus/swineflu.html#cat 1
15. http://www.cdc.gov/swineflu/swineflu_you.htm

## کاریگەریی فیلم، گۆرانی و کایە(یاری)ی توندوتیژیی ڤیدیۆیی لەسەر بیر و ئاکاری منداڵان و گەنجان



پێشکەوت و دەستکەوتەکانی سەرسوورهێنەری تەکنۆلۆژیی لە نیوسەدەی رابردوودا بۆتە هۆی گۆڕانکارییەکی مەزن لە شێوازی ژیانی گەلانی دونیا. بێگومان هەرچەشنە ئاڵوگۆڕ و دەستکەوتەکانی زانستیی ـ تەکنیکی بە پێی بە کارهێنانیان دەتوانن کاریگەرییەکی دوولایەنەی ـ دژبەیەک لە ژیانی رۆژانەی خەڵکدا هەبێ. لەبەر دەست بوونی کامپیوتێر نە تەنیا تەواوی سنوورەکانی جوگرافیای ـ سیاسیی دونیای تێکشکاندوە و بواری پێوەندیی گەلانی جیهانی بۆ وەدەست هێنانی ئاخرین دەستکەوتەکان و ئاڵوگۆڕەکانی زانستیی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، ئابووریی و کولتووریی پێکهێناوە، هاوکات بۆتە هۆی مەترسییلە بوارەکانی سەلامەتیی رۆحیی، ئاکار و رەفتاری کۆمەڵایەتیی، دەرس خوێندن بۆ منداڵان و لاوان. کاریگەریی ماڵوێرانکەر و تێکدەری فیلمگەلی گرژی تەلەفزیۆن، کایە جۆراوجۆرەکانی ئینتەرنێت ـ ڤیدیۆیی و گۆرانییەکانی متاڵ لە سەر منداڵان و گەنجان و لاسەنگیی دەروونیی ـ جەستە وەک بەرهەمی ئەوان، بۆتە هۆی

پێکهاتنی نەخۆشییگەلێک وەکو "سیندرۆمی ئینتەرنێت" و سێندرۆمی جیهانی ناپاک. فیلمگەلی گرژی تەلەفزیۆن و گۆرانییەکانی متاڵ رۆڵێکی بەر چاویان هەیە لە سەرگۆڕانی ئاکار و رەفتاری منداڵان و گەنجان و راکێشانی ئەوان بەرەو پاسیفیزم، کزیی و دوورەپەرێزیی، پەرەگرتنی تاوانبارییی و خەتاکاریی، گرژیی و کێشەکانی نێو بنەماڵە، لەبەرچاونەگرتنی یاساکانی کۆمەڵگا، سووکایەتیکردن بە مافی خەڵکیتر ـ بە تایبەتیی ژنان، دواکەوتن لە دەرس خوێندن و هاتنەخوارێی رێژەی نمرەکانی قوتابخانە، پڕوپووچیی، کەم هۆشیی، هاتنەخوارێی رادەی تێگەیشتوویی زانستیی و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی و لە دەستدانی هەستی بەشداریی لە هەر چەشنە چالاکییەکی بە کەڵکی کۆمەڵایەتیی، زانستیی، هونەریی، وەرزشیی و هاتووچۆ و تێکەڵبوون لەگەڵ دۆستان و خزم و ناسیاوان. بە داخەوە هەر لەو کاتەدا کە پەرەگرتنی ئەم نەخۆشییەماڵوێرانکەرە وەک بەرهەمی دەستکەوتەکانی زانستیی کۆتایی سەدەی ٢٠ و سەرەتای سەدەی ٢١، ژیانی بەشێکی زۆر لە منداڵان و گەنجانی چوار گۆشەی جیهانی خستۆتە مەترسییەوە، بێجگە لە بوارێکی تەسک لە ئەمریکا و بەشێک لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئەوروپایی، بایەخێکی وەها بەم گرفتە گەورە کۆمەڵایەتییە نەدراوە و بە پێچەوانە بە یارمەتیی کەرەستەی پێوەندیی گشتیی، کۆمپانیا گەورەکان و دیکترینی پاکانەکەر، تەبلیغاتێکی(ریکلام) بەرچاو و بەربڵاو بۆنیشاندانی کاریگەریی باشی فیلمەکانی هۆلیوودی، کایە جۆراوجۆرەکانی ڤیدیۆیی ـ ئینترنێتیی بۆ بارهێنانی فکریی منداڵان و گەنجان و پەرەگرتن و بڵاوکردنەوەی لە رادەبەدەری کەرەسەکانی پلەیستەیشن، سی دی گرووپەکانی راک متاڵ، رەپ، متاڵی قورس، متاڵی مردن، ئالتەرناتیڤ و هتد ... لە نێوان منداڵان و گەنجان دراوە. کارتێکەریی تێکدەر و ماڵوێرانکەری ئەو بابەتانەی کە لە سەرەوە باسیان کرا بە حەق بۆتە هۆی ناڕەحەتیی، پەشێویی و ترسی زۆربەی بنەماڵەکان سەبارەت بەسلامەتیی

رۆحیی - رەوانیی(دەروونیی) و داهاتووی نادیاری منداڵەکانیان. لەم نوسراوەدا بەپێی کار و لێکۆڵینەوەی پسپۆڕانی ئەمریکی و سەرژمێر و نموونەکانی بڵاوکراوە بە کورتی باسی کارتێکەریی تێکدەرانەی فیلمە توندوتیژەکانی تەلەڤزیۆن و سینەما، کایەکانی ڤیدیۆیی - ئینتەرنێتیی و گۆڕانی گروپە جۆراوجۆرەکانی متاڵ و رەپ، لە ژیانی منداڵان و گەنجان دەکەین.

**توندوتیژیی و رابواردنرا.** کێشانی خەڵک بۆ تەماشای نمایشی گرژ مێژوویەکی کۆنی هەیە. لە رۆمی کۆندا یەکێک لە هۆکانی رابواردنی خەڵک، سەیری شەڕی گلادیاتۆرەکان لەگەڵ یەکتر یا ئاژەڵە دەڕندەکان بو. گلادیاتۆرەکان لەبەرچاو و قرموقاڵی خەڵک تا کاتی کوشتنی حەریف(رکابەر) درێژەیان بە ململانێیەکی خوێنبار دەدا. ئەمڕۆ ئەم چەشنە رابواردنە لە رێگای سینەما، تەلەڤزیۆن و کایەکانی ئینتەرنێتیی بە شێوەیەکی ئەوڕۆیی چۆتە نێو ماڵ و ژیانی خەڵک. بەشێکی بەرچاوی خەڵک، بێ لەبەرچاو گرتنی تەمەن، رەگەز، جنس، کار و چۆنیەتی کۆمەڵایەتییان بە چەشنێکی پاسیف لە ژێر کارتێکەریی ئەوانن. بە باوەڕی "جۆرج گێربنێر" لێکولینەری ئەمریکایی" هیچ کات فەرهەنگی کۆمەڵگا بەم چەشنە گۆڕەپانی تەواو رەنگی توند و تیژیی نەبووە".

**توندوتیژیی و فیلم.** زۆربەی فیلمەگرژەکانی تەلەڤزیۆن وێنەیەکی هەڵگەڕاوە و بەراوەژوو و ناڕێک لە کۆمەڵگا، چۆنیەتی و توانای مرۆڤ و پێوەندیییەکانی کۆمەڵگا نیشان دەدەن. تا ئەو کاتەی مرۆڤ ئاگاداری ئەم ناڕاستییە نەبێتەوە، ژیان و داهاتووی ئەو تووشی پەشێویی و کارەساتی چاوەڕوان نەکراو دەکرێ. منداڵان و گەنجان لە ژێر کارتێکەریی بەردەوامی فیلمی گرژ و بەراوەژووکراوی راستییەکانی ژیان و گەورەکردنەوەی رووداوەکان بە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنێکی ناڕاست لەوان دەگەن، تووشی خەیاڵپەروەریی، گەورە کردنەوەی دوور لە راستیی گیروگرفتەکانی کۆمەڵگا،

شەڕخوازی و توندوتیژیی لەگەڵ بنەماڵە و دۆستان دەبن و پاش قەبووڵ کردنی ئەم هەڵبەستراوانە، هەر چەشنە گومانێک بە راست لە قەڵەم دەدەن. فیلمی گرژ دەبێتە هۆی پەرەسەندنی شەڕخوازیی، هەروەها تێکدانی هەستیاریی لە توندوتیژیی و ترس لەجیهانی دەوروبەر. بە پێی تۆێژینەوەی لێکۆڵینەرانێکی وەک رۆبێرت لیبێرت[١٩٧] و جۆیس سپراڤکین[١٩٨] تەماشای بەردەوامی دیمەنی گرژ لە تەلەڤزیۆندا لە سەر خەڵک کارتێکەرییەکی دژ بە کۆمەڵی هەیە، گرژیی و شەڕخوازیی یەکەم شێوەی پێشوازیی ئەوان لە زۆربەی مەسەلەکان و گیروگرفتەکانی رۆژانە و هۆی پەرەسەندنی شەڕخوازیی و توندوتیژیی لە کۆمەڵگادایە. بۆ وێنە دوو ساڵ پاش هاتنی تەلەڤزیۆن بۆ شاری دوورکەوتووی نۆتێل[١٩٩] لە کانادا، رێژەی شەڕ و دەستدرێژیی فیزیکیی لە سەتا ١٦٠ زیادی کرد. بە باوەڕی براندۆن ئێس[٢٠٠] پەتاناسی زانستگای واشنگتۆن، لە نەبوونی بیری تەکنۆلۆژیی تەلەڤزیۆندا "پیاوکوژیی تا هەزار کەڕەت، دەستدرێژی جنسیی تا ٧٠ هەزار جار و ئازار بە هۆی لێدان و بریندار کردنەوە تا ٧٠٠ هەزار جار لە ساڵدا کەمتر رووی داوە. بە پێی لێکۆڵینەوەی "گێربنێر" منداڵانی ئەمریکایی لە ساڵانی دەرس خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتاییدا شایەتی پتر لە ٨ هەزار شانۆی پیاو کوشتن و ١٠٠ هەزار بابەتی توند و تیژیی لە فیلمەکانی تلەویزیۆنین". قوتابییەکی پۆلی هەشت بەلانیکەمەوە لە رۆژدا تا ٤ کاتژمێر تەماشای تەلەڤزیۆن دەکا، کە لە سەتا٦٠ی شانۆکان پڕ لە توند و تیژیین. لە لێکۆڵینەوەکانی ساڵانی دەیەی ٦٠ی زایینییدا لە سەر ٦٠٠ کەس کە لە تەمەنی نێوان ٨ تا ١٨ دا بوون، نیشانی داوە کە منداڵانی ٨ ساڵە کە پتر لە

---

197 Robert Liebert
198 Joyce Sprafkin
199 Notel
200 Brandon S

منداڵانی‌تر سەیری فیلمەگرژەکان دەکەن زۆرتر تووشی شەڕوشوور دەبن. لە دەیەی رابردوودا، یەکێتیی پزیشکیی ئەمریکا، ئاکادمی پزیشکیی منداڵانی ئەمریکا، ئاکادمیی رەوانناسیی(دەروونزانی) منداڵانی ئامریکا و ئەنستیتیۆی نەتەوەیی سەڵامەتیی رەوان بەشێوەیەکی سەربەخۆ و جیا لە یەکتر دەستیان بە تۆیژینەوەی زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی رابردوویان کرد، و هەموویان بە ئاکامێکی یەکسان سەبارەت بەکارتێکەریی و گۆڕانی توندوتیژییەکانی تەلەڤزیۆن بە توندوتیژیی راستەقینە لە ژیانی رۆژانە و زۆربوونی رادەی ئاکاری گرژانە لە نێوان منداڵان و گەنجان گەیشتن.

زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر چەند خاڵێکی هاوبەش و سەرەکیی هاوبیروڕان:

دیتنی بەردەوام و رێکوپێکی شانۆگەلی پڕ لە گرژیی فیلمەکان، کاریگەری‌یەکی نەرێنیی‌یان لە سەر ئاکار و بۆچوونی مرۆڤ هەیە.

توندوتیژیی‌یەکانی تەلەڤزیۆن هۆی بڵاوکردنەوەی چەشنە جۆراوجۆرەکانی ئاکاری گرژ و شەڕانین، بایەخگەلی ئەخلاقیی و کۆمەڵایەتیی دەخەنە ژێر کاریگەریی خۆیان و هەڵدانی توند و تیژیی لە ژیانی رۆژانەدا بە مەسەلەیەکی ئاسایی لە قەڵەم دەدەن.

زۆر وێچوویی سەرهەڵدانی ئاکاری گرژانە و توندوتیژ لە نێو ئەو منداڵانەی کە فیلمگەلی گرژ دەبینن.

توند و تیژی فیلمگەلی گرژ بێ لە بەرچاو گرتنی تەمەن، رەگەز و رادەی جیاوازی هۆش و هەڵکەوتوویی کۆمەڵایەتی ـ ئابووریی بینەرانی، کاریگەرییەکی نەرێنیی‌یان لە سەریان هەیە.

ئەوانەی کە بە شێوەیەکی بەرچاو تەماشای فیلمگەلی گرژ دەکەن، بە هەستێکی رەشبینانەوە لە دونیای دەوروبەر دەڕوانن و بەهەڵسەنگاندنێکی دوور لە راستی لە گرژیی و توندوتیژیی نێو کۆمەڵگا و نێو بنەماڵە دەگەن.

زۆربەی تۆیژەران هەروەها ئاماژە بە پێوەندیی راستەوخۆ و درێژخایەنی چەند بابەت لە کارتێکەریی فیلمگەلی تەلەڤزیۆن لە پێکهاتنی شەڕوشوور و توندوتیژی بینەران دەکەن، کە دەتوانین ئەوان لە بوارەکانی خوارەوە کۆ کەینەوە:

**لاساییکردنەوە**. لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠دا، رەخنەگرانی کۆمەڵایەتیی لە ئەمریکادا سەبارەت بە لاساییکردنەوەی لاوان لە چیرۆکە گرژەکانی روژنامەکان و دووپات کردنەوەی ئەوان لە ژیانی راستەقینەی خۆیاندا وشیاریاندا. بەڵام سەرەڕای ئەمەش تەنیا پاش ساڵی ١٩٦٨ زایینی سەبارەت بەم مەسەلەیە لێکۆڵینەوەی جیددی دەستی پێکرد و سەرنج درایە سەر پێوەندیی شانۆگەلی گرژی فیلمە تلەویزیونییەکان لەگەڵ ناکۆکییەکانی ئاکاریی و شەڕانەی منداڵان. ناڕەزایی کۆمەڵگا دژ بە گرژیی ئامرازە پێوەندیی‌یە گشتیی‌یەکان و کارتێکەریی ئەوان لە بردنەسەرەوەی رادەی تاوانباریی و توندوتیژیی لاوان و گەنجان بە تایبەتیی پاش ساڵی ١٩٩٥ی زایینی هاوکات لەگەڵ زۆربوونی پەیتا پەیتای تەقەکردن لە قوتابخانەکانی ئەمریکا و کوژرانی قوتابیان و مامۆستایان بەو پەڕی خۆی گەیشت. سوتاندنی ماڵێک لە لایەن منداڵێکی ٥ ساڵانە لە ساڵی ١٩٩٣دا کە بە شێوەیەکی بەردەوام تەماشای فیلمی "بێویس و بات هێد "[٢٠١] ـ ی دەکرد و کوژرانی خوشکەگەورەکەی لە ئاگردا، تەقەکردنی دوو گەنجی ئەمریکایی لە ساڵی ١٩٩٥ لە شاری نیویۆرک لە شەمەندەفەرێکدا بە لاسایی لە فیلمی " شەمەندەفەری پارە"[٢٠٢]، کوژرانی ٣ قوتابیی و برینداربوونی ٨ کەس لە لایەن مایکل کارنیل-ی[٢٠٣] ١٤ ساڵە لە قوتابخانەیەکی پادۆکای رۆژئاوا[٢٠٤] لە

201 Beavis and Butt – Head
202 Money Train
203 Micheal Carneal
204 West Paducah

ئەیالەتی کنتاکیی بە لاسایی لە "بیرەوەریەکانی رۆژانەی بەسکتبالیستێک" [205] بە کایەکەریی لیۆناردۆ دی کاپریۆ لە دیسەمبەری ساڵی١٩٩٧دا، بەژێرەوەکردنی چەند کەس لە جادەیەکی ئەیالەتی کنتاکیی لە لایەن ٣ گەنجەوە بە لاسایی کردنەوە لە "ئەم تی ویس جێکاس" [206] سەرنج و هەستیاریی کۆمەڵگای زۆرتر بەرەو ئەم قەیرانە گەورە کۆمەڵایەتییە راکێشا.

**لە ناوبردنی هەستیاریی.** بێگومان لە ناوبردنی هەستیاریی بە چەشنی دابەزینی ئاستی ترسی بینەران لە دووپاتبوونەوەی توند و تیژیی لە ژیانی راستەقینەدا، یەکێک لە کاریگەرییەکانی وێرانکەری گرژیی تلەویزیۆنییە. بینەر تا رادەیەکی زۆر خوو بە دیتنی نمایشگەلێکی گرژ دەکا، تەنیا گرژییەکی بە هێزتر لەو شتەی کە دیویەتی دەتوانێ رایتەکێنێ. لە نێو هەندێ مرۆڤدا هەڵسەنگاندنێکی ناڕاست دەبێتە هۆی ناڕاست لە قەڵەم دانی توندوتیژییەکانی راستەقینەی نێو کۆمەڵگا. بە پێی لێکۆڵینەوەکان ئەو منداڵانەی کە بەشێوەیەکی بەردەوام تەماشای پرۆگرامەتوندوتیژەئامێزەکانی تلەویزیۆن دەکەن، بە بەراورد لەگەڵ منداڵگەلێک کە کەمتر بینەری ئەم چەشنە فیلمانەن، لە کاتی کێشە وهەرادا کەمتر داوای یارمەتی لە دایک و باوک و یا کەسانیتر دەکەن. بە باوەڕی ئەوان سەرهەڵدانی ئەم چەشنە ناکۆکییانە لە بنەماڵە، قوتابخانە و کۆمەڵگا بە تەواویی ئاساییە.

**هەست بە قوربانی بوون**[207]. بە باوەڕی ئلیزابێت تۆملان[208] لە ناوەندی بارهێنانی کەرەسەی پێوەندیی گشتیی[209] "نیشاندانی بەردەوامی توند و تیژیی لە کەرەسەکانی پێوەندیی گشتیی، دەبێتە هۆی بڕواهێنان بە بوونی

205 Basketball Diaries
206 MTV’s Jackass
207 Victim Effect
208 Elizabeth Thomlan
209 Media Literacy Center

گرژیی لە هەموو شوێنێک و لە ئاکامدا پێکهێنانی هەستی ترس و گەورەکردنی ئەو لە نێو خەڵکدا. ئەو کەسانەی کە بە شێوەیەکی بەردەوام تەماشای فیلمگەلی گرژ دەکەن، پتر لە خەڵکی تر باوەڕیان بە پڕمەترسیی بوونی جیهانی دەوروبەر هەیە. بە پێی لێکۆڵینەوەکانی "گێربنێر" لەو کەسانەی کە ڕۆژانە پتر لە ٦ کاتژمێر تەماشای تەلەڤزیۆن دەکەن ( بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە ٣ کاتژمێر لە ڕۆژدا تەماشا دەکەن) "سێندرۆمی دونیای ناپاک" زۆرتر دەبیندرێ، و ئەوان زۆرتر لە خەڵکیتر بۆ پاڕاستنی خۆیان ڕوو لە کڕینی چەکی زۆرتر، سەگی پاسەوان، دەزگای بەرگریی و پارێزکەری ماڵ و قوفڵی میکانیکیی و ئەڵکیترۆنیکیی دێنن.

### کایەی ئینتەرنێت ـ ڤیدیۆیی:
### خووگریی(هۆگربوون)

ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان‌دا کایەی ڤیدیۆیی ـ ئینتەرنێتیی یەکێک لە سەرەکییترین شێوەکانی رابواردنی منداڵان و گەنجانە. مەیل بەم کایانە، بەتایبەتیی چەشنیM (بۆ گەورەساڵان) هۆی پێکهاتنی خووگریی، شەڕانی بوون، ئازار و زیان پێگەیشتنی مێشک، لاسەنگیی ئاکار و رەفتار لە بەشێکی زۆری ئەم کەسانەیە، تا ئەو رادەیە کە بەشێکی زۆر لە دوکتورەکان ئەم ئاکارانە بە رادەی نەخۆشییەکانی رەوانی(دەروونی) لە قەڵەم دەدەن و پێیان وایە مەترسیی ئەم کایانە لەسەر رۆح و رەوان خراپترە لە خووگریی بە ماددە سڕکەرەکان لە چەشنی هرۆیین. بە باوەڕی ئەوان هیچ جیاوازییەک لە نێوان شێوەی دەرمانی ئەم کەسانە لەگەڵ دەرمان بۆ وەلانانی ماددەی سڕکەر و ئەلکۆڵ نییە، تەنانەت جار و بار رادەی خۆڕاگریی ئەم کەسانە بە بەراوەرد لەگەڵ خووپێگرتووەکان بە ماددەی سڕکەر و ئەلکۆڵییەکان لە بەرانبەر دەرماندا زۆرتریشە.






له ئەمریکادا پتر لە ٢٠ میلیۆن کەس کە تەمەنیان لە ژێرەوەی ١٨ ساڵییدایە، خەریکی کایەکانی ئینتەرنێتین. لەم کەسانەدا، بە پێی ڕاگەیاندنی یەکێتیی پزیشکیی ئەمریکا، پتر لە ٥ میلیۆن منداڵ و گەنجی ئەمریکایی خووگری کایەکانی ڤیدیۆیی - ئینتەرنێتیین. حاڵەتی خووگریی زۆرتر لەو کەسانەدا دەبیندرێ کە لە کەم تەمەنییدا دەست بەم کایانە دەکەن.

**ئازاری مێشک**

لێکۆڵینەوەکانی زۆربەی ڕاوێژکاران نیشاندەری دابەزینی ڕادەی کاری مێشک، ئازاریسارێژنەبووەی بەشی پێشەوەی مێشک، یانی ناوچەی هەست و داهێنانی ئەو کەسانەیە کە بەشێوەیەکی بەردەوام خەریکی کایەکانی ئێنتێرنتیین.

بەپێی لێکۆڵینەوەکانی دوکتور"وینسنت ماتیوس"[٢١٠] پرۆفسۆری ڕادیۆلۆژیی و سەرۆکی دپارتمانی ڕادیۆلۆژیی دەمار لە زانکۆی پزیشکیی زانستگای ئیندیانا لە شاری ئیندیاناپالیسی ئەمریکا، "کایەی بەردەوام و ڕۆژانەی ئینتەرنێتیی بەتایبەت لە چەشنی گرژ و جیمزباندیی هۆی گۆڕانی

210 Dr. Vincent Mathews

فیزیۆلۆژیی و فۆنکسیۆنی مێشکە. ئەم چەشنە کایانە دەبنە هۆی زۆربوونی کاری بەشی ئامیگدالای[211] مێشک - ناوچەی بزوێنەری کاردانەوەی سترێس(دڵەراوکێ) و هاوکات هاتنەخوارەوەی کاری بەشی فرۆنتاڵی (نێوچاوانی) مێشک - ناوچەی خۆڕاگریی، بڕیاردارن و ئاکار و ڕەفتار، هەروەها سەرنج و کارەکانیتری بەشی تێگەیشتن."

ئەم لێکۆڵینەوانە ئاکامی هەڵسەنگاندنی کاری مێشکی ٤٤ گەنجی هاوتەمەن و هاورەگەز کە ئاستی هۆشیان وەک یەک وایە. لەم کەسانەدا واکرابو تا بۆ ماوەی نیو کاتژمێر بە مەیل و ویستی خۆیان خەریکی کایەی گرژ یا ناگرژی ڤیدیۆیی بن. زێدەکاریی ئامیگدالا و هاتنەخوارێی کاری بەشی نێوچاوانی مێشک لەو کەسانەیدا دیترا کە خەریکی کایەی گرژ بوون.




کاری مێشکی ئەم کەسانە بە یارمەتیی دەزگای " شکڵ دروستکردنی موگناتیزیی ڤونکسیۆنال بە یاریدەی دەنگێکی بە هێز[212] دیارییکرا.

---

211 Amygdala
212 fMRI- functional Magnetic Resonance Imaging

لێکۆڵینەوەکانی ئاکیۆ ـ مۆری[213] پرۆفسۆری دەمارناسی زانستگای نیهۆنی ژاپۆن نیشاندەری هاتنەخوارەوەی کاری شەپۆلەکانی بێتای( ß ) ئەو کەسانەیە کە رۆژانە٢ تا ٧ کاتژمێر خەریکی کایەی ڤیدیۆیی دەبن. ئەم شەپۆلانە لە پێوەندەیی لەگەڵ هەست ـ سۆز، کایە و خۆراگریی مرۆڤن.

به باوەڕی پرۆفسۆر مۆری "کایەی ڤیدیۆیی هۆی نائارامیی، زوو تووڕەبوون یا هەڵچوون، پێکهاتنی ترس و پەشێویی لە منداڵاندایە و کارتێکەریی‌یەکی راستەوخۆ و نەرێنیی لە سەر کاری دەماری خودموختاردا هەیە."

## گرژیی و توندوتیژیی:

زۆربەی لێکۆڵینەوەکان پیشاندەری پێوەندیی راستەوخۆی کایەکانی ڤیدیۆیی ـ ئێنتێرنێتیی لە پێکهاتن و پەرەگرتنی گرژیی، توندوتیژیی و تاوانکاریی لە لاوانی ژێرەوەی ١٨ساڵدایە. بە باوەڕی زۆربەی پسپۆڕان، لە جیهانی سەرسووڕهێنەری کامپیۆتر، کوشتن بۆتە چەشنە وەرزشێکی خەیاڵیی، کە هاندەری منداڵان و گەنجانە بەرەو توندوتیژیی‌یەکی راستەقینەیە. لاسایی‌کردنەوە لە کایە گێرەکانی سەرەکیی ئەم کایانە لە دژایەتی و شەڕ لەگەڵ دوژمنە خەیاڵیی‌یەکان، بەکارهێنانی چەکی کوژەر، بە ئەستۆگرتنی نەخشی تەقەکەر و پیاوکوژ و ئیمتیازوەرگرتنی زۆرتر بە پێی باشتر بەجیٚ‌هێنانی بوارەکانی سەرەوە، نە تەنیا دەبێتە هۆی بارهێنانی هەستی پیاوکوژیی و دەستدرێژیی، تەنانەت لەزەت بردن لەم چەشنە حەرەکەتانە. بە باوەڕ و خەیاڵی ئەوان، شەڕ و لێدان، کوشتن و دەستدرێژیی لە ژنان و پەنا بردن بە گرژیی و توندوتیژیی کارێکی ئاسایی‌یە.

---

213 Akio Mori

کایەی" خاڵی ئامانج و تەقەکردن[214] رۆڵێکی بەر چاوی لە فێرکردنی نیشانەگیریی، تەقەکردن و کوشتنی ئامانجی مرۆیی و بارهێنانی پیاوکوژ هەیە. بە پێی لێکۆڵینەوەکان کایەگەلێک وەک Doom، Wolfstein D٣، Mortal Kombat بوونەتە هۆی زیادکردنی رادەی گرژی و توندوتیژیی، گۆڕانی ئاکار و رەفتار و هەروەها بەکارهێنانی کایەکانی گرژیی خەیاڵی لە ژیانی راستەقینەی منداڵاندا.

ئاشکرابوونی ئەم راستییە کە کوژەرانی قوتابییەکان و مامۆستاکانی ئەمریکا کایەکەری بەردەوامی کایەگەلی گرژی ڤیدیۆیی بوون، سەرنجی بیروڕای گشتی خەڵکی ئەمریکای زۆرتر بەرەو گرنگی ئەم مەسەلەیە راکێشا.

بۆ وێنە مایکل کارنیلیی ١٤ ساڵە کە لە یەکی دسامبری ١٩٩٧ دا لە قوتابخانەیەک لە پادۆکای رۆژئاوای هەرێمی کنتاکیی، ٣ هاوپۆلی خۆی کوشت و ٨ کەسی‌تریشی بریندار کرد و ئەریک هاریسی ١٨ ساڵەو دایلان کلیبۆڵدی ١٧ ساڵان کە لە٢٠ ی ئابریل(نیسان)ی ١٩٩٩ دا لە قوتابخانەی کلۆمبیەن لە لیتلیتۆنی[215] کلۆرادا پێش کوشتنی خۆیان، گیانی ١٣ کەسیان بە چەکی نیوەئۆتۆماتیک گرت، کایەکەری بەردەوام و نەگۆڕی کایەی فرەگرژی Doom بوون.

کایەی گرژی ڤیدیۆیی بە پێی پێکهێنانی سترێسی لە رادەبەدەر، سەرنجی منداڵان و لاوان زۆرتر بەرەو خۆ رادەکێشێ. پڕۆپاگەندەی بەربڵاو بۆ کایەکانی ڤیدیۆیی لە چەشنی M لە کەرەسەی پێوەندیی گشتییەکاندا کە تەنانەت لە گۆڤاری منداڵانیش بڵاو دەبێتەوە، فرۆشتنی کۆنترۆل نەکراوی ئەم کایانە بە منداڵان و لاوانی ژێرەوەی ١٨ ساڵ رۆڵێکی پڕ لە مەترسییان لە کێشانی منداڵان بەرەو ئەم کایانە هەیە.

214 that point – and – shoot
215 Littleton






سەردێڕو پڕۆپاگەندەی ئەم کایانە لە گۆڤاری منداڵان پیشاندەری ڕۆڵی نەرێنیی ئەوان لە پێکهاتن، پەرەسەندن و ئاسایی پیشاندانی توندوتیژیی و ئاکاری گرژانە لە بیر و ژیانی منداڵان و لاوانە:

بێ هەست بەگوناه دۆستەکانت بکوژە!

بەرچاوتر لە کوشتنی پشیلەی جیرانەکەت!

لە پڕۆپاگەندە بۆ کایەی Destrega : دەست بکەین بەکوشتاری گشتیی!

لەپڕۆپاگەندە بۆ کایەی Carmageddon : بەئاسانی کوشتنی منداڵێک بە تەورە!

لەپڕۆپاگەندە بۆ کایەی Quake : لەت و پەتبوونی هاوڕێکانت پاش هێرشی موشەکەکان (ڕاکێتەکان) تازە سەرەتای کارە!

دوکترینی کۆمپانییە بەرهەمهێنەرەکانی کایەی ڤیدیۆیی، دەزگاکانی پلەی ستەیشن و نینتەندۆ بە پێی قازانجی لە ڕادەبەدەر و سەرسووڕهێنەری ساڵانەی ئەم کۆمپانیایانە(پتر لە١٠ ملیارد دۆلار) تێدەکۆشن بە حاشا کردن لە کاریگەریی نەرێنیی ئەم کایانە، پڕۆپاگەندە بۆ کاریگەریی باش و ئەرێنیی ئەوان لە گەشەکردنی بیر و هۆشی منداڵان بکەن. بە باوەڕی ئەوان، تاوانکاریی لاوانی ئەمریکایی هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ئەم کایانە نییە، دەنا دەبێ تەواوی کایەگێڕەکان پیاوکوژ و تاوانکار بان. لە ڕاپۆرتی "پرۆڤسۆر ئەل. ڕوول هۆیسمەن" بۆ کۆمیتەی ئەنجوومەنی سنای ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٨دا لە وەڵام بەم چەشنە کەسانە هاتووە: "بێ

گومان تەماشای شانۆی گرژ یا کایەی گرژی ڤیدیۆیی نابێتە هۆی توندوتیژیی رەفتاری هەر منداڵێک.  فاکتەرگەلێکی‌تریش دەبێ یاریدە بەم مەسەلەیە بدەن، هەروەک لەم دواییانە لە کلۆرادو کرا. بەڵام هەر وەک  تاقە جگەرەیەک شانسی سەهەڵدانی سەرەتان زیاد دەکا، هەر بەو رادەیەش وێدەچێ ئەم چەشنە فیلمانە شانسی هەڵدانی ئاکار و رەفتاری گرژ لە منداڵان زۆر بکەن."

**موزیک و گۆرانی‌یە خولقێنەرەکانی توندوتیژیی:**

کەمتر کەسێک هەیەگومانی هەبێت لەسەر کاریگەریی موزیک لە سەر رۆح و رەوانی. بە باوەڕی ئەفلاتوون" مێلۆدی و ئاهەنگی موسیقی کاریگەرییەکن دڵنشینی لە سەر رۆحیی مرۆڤ هەیە، ئەگەر بە درووستی کەڵکی لێ وەربگیرێ، دەتوانێ هۆی جێگیربوونی جوانی لە نێو خەیاڵاتی رۆحدا بێت. ئەو لە پێناسەی مۆسیقی‌دا دەبێژێ: مۆسیقی ناموسێکی ئەخلاقیی‌یە کە رۆح بە تەواوی خەڵکی جیهان، باڵ بە بیر، فڕین بە خەیاڵ، گۆڕینی خەم بە شادی، و ژیان بە هەمو شتێک دەبەخشێ". موزیک بەشێکی جیانەکراوەی ژیانی مرۆڤە، مرۆڤ لە کاتی ئێش و پەژارە، شادیی و خۆشیی پەنا بۆ موزیک دەبا، بە بیستنی گەشکە دەیگرێ و هەڵدەپەڕێ، جاروباریش سۆزی مۆسیقاکە وەگریانی دەخا. ئەمڕۆ مۆسیقی جێگەیەکی تایبەتیی لە ژیانی لاواندا هەیە. بە پێی لێکۆڵینەوەکان، لاوانی ١٤ تا ١٦ساڵەی ئەمریکی بەلانی‌کەمەوە ٤٠ کاتژمێر لە حەوتوودا گوێ لە موزیک رادەگرن. مۆسیقی سەرەڕای کاریگەرییە باشەکانی، دەتوانێ رۆڵێکی خراپیشی لە سەر ژیان و ئاکاری منداڵان هەبێ. بە پێی لیکۆڵینەوەکانی یەکێتیی پسیکۆلۆژیی ئەمریکا موزیکە گرژیی خوڵقێنەرەکان هۆی زۆربوونی توندوتیژیی رەفتاریی ـ عاتیفیی منداڵان و لاوانن". بە پێچەوانەی باوەڕی کۆنفۆسیۆن، لەم حاڵەتەدا موسیقی بە جێگای ئەوەی‌کە "هۆی باشترکردنی

دابونەریتەکان وئەخلاقی کۆمەڵگا، دۆستیی و چاکەخوازیی بێ" دەبێتەهاندەری توند و تیژیی، خۆکوشتن، گرژیی، خووگرتن بە ماددەی سڕکەر، سەرنجدانی پێشوەخت بە سێکس، زگپڕی کچان و سووکایەتی بە ژنان.

بەداخەوە لە زۆربەی وڵاتان کەمتر سەرنج بە کاریگەریی ئاواز و موزیکە گرژییهێنەرەکان لە سەر منداڵان دەدرێ. زۆربەی گۆرانییەکانی گرووپگەلێک وەک "ناین ێینچ نەیلز"[٢١٦] و "مەرلین مانسۆن"[٢١٧] کە پڕوپاگەندە بۆ توندوتیژیی فیزیکیی - جنسیی لەگەڵ ژنان و منداڵان، کوشتن و قڕکردن، پەنابردن بەماددەی سڕکەر و خۆکوشتن دەکەن، نە تەنیا بە ئازادیییەکی بێسنوور و بەربڵاو دەفرۆشرێن، تەنانەت لە لایەن کەناڵێکی بە نێوبانگ و پڕبینەری تەلەڤزیۆنیی وەک MTV وەکو باشترین گۆڕانییبێژانی ساڵ خەڵاتی "گرێمی"[٢١٨] شیان پێشکەش دەکەن ( لە ساڵەکانی ١٩٩٨ و ١٩٩٩زایینییدا).

سەردێڕ و نێوەڕۆکی بەشێک لەم گۆرانییانە نیشاندەری پڕوپاگەندەی لە رادەبەدەری بە رواڵەت ئەم چەشنە هونەرمەندە مۆدێرنانە بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوی گرژیی و توندوتیژیی دژ بەکۆمەڵگا، لە بەرچاو نەگرتنی یاساگەلی کۆمەڵایەتیی و مرۆیی لە کۆمەڵگا و بنەماڵەدایە. نموونەیەک لەگۆڕانییەکانی مەرلین مانسۆن:

کێ دەڵێ دەسدرێژیی جنسیی لە کاتی کەیف و بەزمدا خۆش نییە!
وەرن هەموویان بکوژین و خودای ئێوە مەڵۆمەڵۆیان بکا!
لە"راپ" دا تەمرینی دڵڕەقیی بکە!

---

216 Nine Inch Nails
217 Marilyn Manson
218 Grammy

کاتێک بۆ جیاوازییدانان نەماوە، بێزار بە لە هەر دایک قەحبەیەک کە بێتە سەر ڕێت!




لە سی دی " پیاوێکی مەزن بە تفەنگەوە" گروپی موسیقیای "ناین ئینچ نەیلز" هاتووە:

"من پیاوێکی مەزنم ( بەڵێ وام)
و تفەنگێکی گەورەم هەیە
سیرەتێکی گەورەم بۆ بێنن
دەمەوێ خۆش بم،
ئەو سیرەتە لە پێش نێوچاوانت ڕاگرە
مەجبورت دەکەم بیمژی
لە وەدەچێ سەرت کوون کەم
دەزانی
تەنیا بۆ کردنی،

من هەر پێنج مرۆڤێکم
و بە چەشنێک خۆم و تفەنگە قۆندەرەکەمت
نیشان دەدەم،
ئێستا هیچ شتێک ناتوانێ پێشم پێ بگرێ
تەقە بکە، تەقە، تەقە، تەقە!

زۆربەی تۆێژەران لە سەر ئەو باوەڕەن کە مۆسیقی بە بەراورد لەگەڵ تەلەڤزیۆندا کارتێکەرییەکی زۆرتری لە سەر رەفتار و ئاکاری منداڵان هەیە. بەپێی ئەو سەرژمێرییانەی کە لەبەر دەستدان لاوانی ئەمریکی لە بەینی پۆلەکانی ٧ تا ١٢ نزیک بە١٠ هەزار و ٥٠٠ کاتژمێر گوێ لە موزیکی راک رادەگرن. لە لێکۆڵینەوەکانی کارناسان و پسپۆڕانی زانستگاکانی بڕواپێکراوی ئەمریکی کارتێکەریی موزیکە گرژیهێنەرەکان لە سەر ئاکار و رەفتاری لاوان سەلمێندراوە. لێکۆڵینەوەکانی زانستگای دەوڵەتیی لووای[219] ئەمریکا سەبارەت بەپێوەندیی موزیک و رەفتاری خوێندکاران، نیشانیداوە کە توندوتیژیی لە نێوان ئەو خوێندکارانەی کە گوێ بەموسیقی گرژییهێنەر دەدەن زۆرتر لە خوێندکارانیترە.

تۆێژینەوەکانی سەبارەت بە پیاوکوژیی لە قوتابخانەکانی ئەمریکی نیشانیانداوە کە زۆربەی ئەو لاوانە وەکو ئەریک هاریس و دایلان کلەبۆلد کوژەری ١٢ کەس لە قوتابخانەیەک لە پەۆکای رۆژئاوای کونتاکیی، کیپ کینکەڵ[220] کوژەری دایک و باوکی خۆی و ٢ قوتابیی لە دەبیرستانی(دواناوەندیی) تەرستۆن[221] لە سپیرئنگفەلدی ئەیالەتی

219 Lowa Statte University
220 Kip Kinkel
221 Thurston

ئۆریگۆن[٢٢٢] ، ئاندریو وورست[٢٢٣] کوڕەری مامۆستایەک لە ئیدەنبۆرنی[٢٢٤] پێنسەلوێنیا، لوک وودهام کوڕەری دایک و باوکی خۆی و ٢ هاوقوتابخانەیی لە دەبیرستانی(ئامادەیی) پیرل[٢٢٥] لە می سی سی پی و .. لە بیسەرانی هەمیشەیی و بەردەوامی گۆرانییەکانی مەرلین مانسۆن و کایەکەری کایەکانی گرژی ویدیویی وەک دۆم[٢٢٦] بوون. بیل ئووینس[٢٢٧] فەرمانداری ئەیالەتی کلۆرادۆ چەند رۆژ پاش کوشتاری قوتابخانەی کلۆمبیەن بە حەق لەو چەشنە موزیکانە وەکو ڤایرۆسێکی کولتووریی نێو دەبا، ئەو رایگەیاند: " ڤایرۆس هاتۆتە نێو فەرهەنگی ئێمە... بەشێک لەو موزیکانەی کە لایەنگرێکی زۆریشیان هەیە بەشێک لەم ڤایرۆسە فەرهەنگیەن کە دەتوانن هۆی کێشانی بەشێک لە لاوانی ئێمە بەرەو توند وتیژیی بن".

بێگومان بەربەرەکانی لەگەڵ کارتێکەریی وێرانکەری فیلمگەلی گرژ، کایە فرەتوندوتیژەکانی ڤیدیۆیی و موزیکە گرژییهێنەری گروپگەلی مێتال، مێتال قورس و ... نە تەنیا پێویستیی بە کۆنترۆل، چاودێریی و روونکردنەوە لە لایەن دایک و باوک هەیە، بەڵکو ئەم کارە گرنگە پێویستیی بە هاوکاریی و کۆنترۆلی دەزگاکانی یاسایی دەوڵەتیی، هەروەها مەدەنیی هەیە. بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم ڤایرۆسە کولتووریی ـ کۆمەڵایەتییە بە هۆی پشتیوانی ماڵیی و پڕوپاگەندەی کۆمپانییە مەزنەکان کارێکی فرە دژوارە، بە تایبەتیی کە سەرەڕای ئەوەیکە منداڵان و لاوان لە ژێر کارتێکەریی پرۆپاگەندەی بەردەوام و سەرسورهێنەری کەرەسەی پێوەندییە

---

222 Origon
223 Andrew Wurst
224 Eidenborn
225 Pearl
226 Doom
227 Bill Owens

گشتییەکان‌دان، دایکان و باوکان سەرقاڵی کار بۆ بە ڕێوەبردنی ژیانن و کاتێکی کەمیان بۆ وتوێژ و رابواردن لەگەڵ منداڵەکانیان هەیە. لەم حاڵەتەدا بەشداری چالاکانەی دەزگاکانی دەوڵەتیی، کۆمەڵایەتیی و مەدەنیی بۆ کۆنترۆڵی بەرهەمهێنان و فرۆش و پڕۆپاگەندەی ئەم چەشنە سی دی و کایانە دەتوانێ رۆڵێکی گرنگ لە بەرگریی لە کارتێکەریی نەرێنیی ئەوان بگێڕێ.

لە کۆتاییدا بەکورتی بەشێک لە پێشنیارەکانی ئاکادێمی پزیشکانی منداڵانی ئەمریکا بۆ بەرەنگاریی و کەمکردنەوەی کارتێکەریی نەرێنیی ئەو بابەتانەی کە باسکران دەخەینە بەرچاوی خوێنەڕان:

١٦. پیشەسازیی بەرهەمەکانی ڤیدیۆ ـ موزیک[٢٢٨] دەبێ تێ بکۆشن بەرهەمهێنەری ڤیدیۆگەلێک بن کە پەیامهێنەری بابەتی باش و ئەرێنیی لە بواری پێوەندیی کۆمەڵایەتیی، هاوئاهەنگیی رەگەزیی، دووری لە ماددەی سڕکەر، خۆپاراستن لە توندوتیژیی، پێشگیریی لە سگپڕی و نەخۆشییەکان لە رێگای سێکسەوەن.

١٧. پیشەسازیی بەرهەمەکانی ڤیدیۆ ـ موزیک دەبێ هەوڵ بۆ پێکهێنانی هەستی خۆشەویستیی، خۆڕاگریی بینەران و بیسەرانیان بدەن.

١٨. پیشەسازیی بەرهەمەکانی ڤیدیۆ ـ موزیک دەبێ موزیکگەلێک بڵاوکەنەوە کە هەڵگری نموونەی ئەرێنیی بۆ ئاکار و ژیانی منداڵان بن.

١٩. پزیشکانی منداڵ دەبێ لە یەکێتیی، هاوکاریی و هاوئاهەنگیی لەگەڵ مامۆستاکانی مەدرەسە و دایک و باوکی منداڵان لە کۆبوونەوەکانی ناوچەیی و سەرتاسەریی، باسی شێوەی کارتیکەریی موزیک لە سەر منداڵان و لاوان بکەن.

---

228 The music video industy

٢٠.  دایکان و باوکان دەبێ رۆڵێکی چالاکیان لە کۆنترۆڵی ئەو موزیکانە بێ کە منداڵەکانیان  دەیکڕن و گوێیان پێدەدەن.

٢١.  پزیشکانی منداڵ دەبێ بەڕێنوێنیکردنی درووستی دایک و باوک یاریدەری ئەوان لە فێربوونی درووستی رۆڵی کەرەسەی پێوەندیی گشتیی بن. دایک و باوک هەوڵ بدەن لەگەڵ منداڵەکانیان تەماشای تەلەڤزیۆن بکەن و باسی نێوەڕۆکی فیلمەکان بکەن.

## سەرچاوەکان:


1. Violence in Media ،James D. Torr ،Book editor،2001 by Greenhaven Press ،Inc ،San Diego ،California،USA
2. Mass Media ،Opposing Viewpoint ،William Dudley ،Book editor ، 2005 by Greenhaven Press ،Inc ،USA
3. Television ،Opposing viewpoints ،thomasori&Gale ،Jamuna Carroll Book Editor 2006 ،USA
4. Violence in Film and television ،James D. Torr Book Edior ،2002 by Greenhaven Press ،Inc ،San Diego ،California،USA
5. Advertising ،Opposing Viewpoint ،Lura K. Egendorf ،Book Editor ،2006 by Greenhaven Press ،Inc ،San Diego ، California،USA
6. Exposure to Violence Media: The Effect of Songs with Violent lyrics on Aggressive Thoughts and Feelings ،Craig A Anderson and Nicholas L. Carnagey-Lowa State University & Janie

Eubanks- Texas Deo. Of Humaen service ،Journal of Personality and Social Psychology 2003 ،Vol.84،No.5 ،960-971

7. Music Videos Promote Adolescent Aggression،By William J. Cromie Gazette Staff ،The Harward University April 09 ،1998 http://www.hno.harvard.edu/gazette/1998/04.09/MusicVideosProm.html
8. Testimony The Social Impact of Music Violence ،AMERICAN ACADEMY OF PEDIATRICS ،Frank Palumbo ،M.D. ،FAAP ، November 6 ،1997 ،
http://www.aap.org/advocacy/washing/t1106.htm
9. Psychology And Music Violence ،
http://www.freeessays.cc/db/39/pnl251.shtm
10. http://www.msnbc.msn.com/id/15938244/site/newsweek/page/0
11. Video game addiction: A new diagnosis? June 21 ،2007 03:20:19 PM PST
http://health.yahoo.com/news/176630

- جستاری در باره‌ماهیت موسیقی، حسن روشان، ماهنامه‌ماندگار، برگرفته‌از سایت قاصدک امید
http://ghasedakeomid.myblog.ir/Cat/10.aspx

# فەرهەنگۆک بۆ بەشی نەخۆشیی دڵ

| ئینگلیسیی | فارسیی | کوردیی |
|---|---|---|
| acute endocarditis | اندوکاردیت حاد | ئێندۆکاردیتی کتوپڕ(هەوی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ) |
| adenovirus | آدنوویروس، ویروسی ازخانواده آدنوویریدها که میتوانند موجب بیماریهای مختلف از قبیل:بیماریهای تنفسی، التهاب ملتحمه چشم، التهاب معده و روده شود. | ئادنۆویروس، ویروسێکە لە بنەماڵەی ئادنۆویروسەکان کە هۆی نەخۆشیی بۆریی هەناسە، هەوی ژێرپێڵووی چاو، هەوی گەدە و ریخۆڵەیە. |
| alcoholism | الکلی بودن | ئەلکۆلیی بوون |
| amphetamine | آمفیتامین؛ دارویی از گروه محرک های سیمپاتیک که موجب تحریک اعصاب مرکزی می‌شود. | ئامفیتامین، دەوایەکە لە گروپی بزوێنەری سیمپاتیک کە هۆی بزواندنی دەمارگەلی ناوەندییە. |
| amyloid | پروتئینی که محصول فساد بافت های بدن می‌باشد. | ئامیلۆئێد – چەشنە پرۆتێینی روون کە بەرهەمی رزیویی تانەکانی لەشە. |
| amyloidosis | آمیلوئیدوز، رسوب و انباشت آمیلوئید در بافت و اندام ها. | ئامیلۆئیدۆز، نیشتن و کۆبوونەوەی ئامیلۆئید لە تان وئەندامەکاندا. |
| anemia | آنمی، کم خونی | ئانێمیی، کەمخوێنیی |
| angina pectoralis | آنژین صدری، درد در قفسه سینه | ئانژینی سنگ، سنگ ئێشە ، کەم خوێنیی دڵ |

| | | |
|---|---|---|
| angioplasty | آنژیوپلاستی، برای پیشگیری از مسدود شدن سرخرگ های کرونری و از بین بردن لخته های خون، کاتتر بالونی را از طریق یکی از شریان های کشاله ران یا دست به سرخرگ‌های کرونری فرستاده، با باد کردن بالون راه را بازمیکنند. | ئانژیۆپلاستیی(قەستەرە)، بۆ پێشگیریی لە بەسترانی خوێنبەری کرۆنێری و لە نێوبردنی دەڵەمەی خوێن، لە ڕێگای خوێنبەرێکی دەست یا لاران زۆندێکی باڵۆن دار دەکرێتە نێو خوێنبەری کرۆنێریی و بە باکردنی باڵۆنەکە، ئەم ڕێگایە دەکرێتەوە. |
| anthracycline | آنتراسیکلین، داروی است که در شیمی درمانی کانسرهایی‌هایی چون سرطان خون کاربرد دارد. | ئانتراسیکلین، دەوایەکە کە بۆ شیمی دەرمانیی شێرپەنجەکان وەک شێرپەنجەی خوێن کە لکی لێ وەردەگرن. |
| anxiety | اضطراب، تشویش | پەشێویی |
| aortic regurgitation | برگرداندن آئورتی، نارسایی دریچه آئورت که موجب پس راندن خون از آئورت به بطن چپ می‌شود. | گەڕاندنەوەی ئائۆرتیی، ناتەواویی دەریچەی ئائۆرت هۆی گەڕانەوەی بەشێک لە خوێنی ئائۆرتە بو سکۆڵەی چەپ. |
| aortic stenosis | تنگی دریچه آئورت | تەنگیی دەریچەی ئائۆرت |
| aortic valve | دریچه آئورت، این دریچه بین بطن چپ و آئورت قراردارد. | دەریچەی ئائۆرت، ئەم دەریچەیە لە نێوان سکۆڵەی چەپ و ئائۆرتە. |
| arrhythmia | آریتمی، بی نظمی ضربان قلب | ئاریتمیی، ناڕێک لێدانی دڵ |

| | | |
|---|---|---|
| arteria coronaria | سرخرگهای کرونری، خون از طریق سرخرگهای کرونری به قلب میرسد. | خوێنبەری کرۆنێریی، خوێن لە ڕێگای خوێنبەرەکای کرۆنێرییەوە دەگاتە دڵ. |
| artery | سرخرگ، شریان | خوێنبەر |
| ascites | آسیت، انباشت غیرطبیعی مایع (آب) در حفرەهای بدن. | ئاسیت، کۆبوونەوەی نائاسایی شلەئاو لە دیوەکانی جەستەدا. |
| aspirin | آسپرین | ئاسپرین |
| atrial arrythmias | آریتمی دهلیزی، بی نظمی ضربان دهلیز قلب. | ئاریتمیی ئاتریال، نارێک لێدانی دالانی دڵ. |
| atrio-ventricular node | گره دهلیزی – بطنی | گرێی دالان – سکۆڵە |
| atrium | آتریوم، دهلیز قلب | ئاتریوم، دالانی دڵ |
| autoimmune disorders | اختلالات خودایمنی، بیماریهای خودایمنی | نەخۆشییەکانی خۆپاریزی یان خۆپاریزیی |
| autoimmune system | سیستم خود ایمنی | سیستمی خۆپاریزی، سیستمی خۆپاریزیی |
| beta blocker | بتابلوکر، بندآورگیرندەهای سیمپاتیک. | بیتابلۆکێر،گروپێک لە دەواکان کە دەبنەهۆی بەسترانی وەرگرەکانی سیمپاتیک. |
| Biscuspide aortic valve | دریچه دولتی آئورت( این دریچه در حالت طبیعی باید سه لت داشته باشد) | دەریچەی دوو پەڕە ئائۆرت ( لە حاڵەتی ئاساییدا ئەم دەریچەیە سێ پەڕەی هەیە) |
| biscuspide aortic valve | دریچه دولتی آئورت( این دریچه در حالت طبیعی | دەریچەی دوو پەڕەی ئائۆرت ( لە حالەتی |

| | | |
|---|---|---|
| | باید سه لت داشته باشد). | ئاسایی دا ئەم دەریچەیە سێ پەڕەی هەیە) |
| blocking | بلوک کردن، مسدود کردن، بستن، بندآوردن | بەستن |
| blood circulation | گردش خون | سیرکولاسیۆنی خوێن، سووڕی خوێن |
| bradycardia | برادیکاردی، کاهش ضربان قلب | برادیکاردیی، خاولێدانی دڵ |
| bypass surgery | عمل بای‌پس، بازکردن یک یا چند مجرای جدید. | نەشتەرگەریی بای‌پەس، دابین‌کردن و کردنەوەی چەند ڕێی تازە. |
| calcium channel blocker | بندآور مجرای کلسیم | گروپێک لە دەواکان کە دەبنە هۆی بەسترانی کاناڵەکانی کالسیۆم. |
| cancer | سرطان | سەرەتان، شێرپەنجە |
| captopril | کاپتوپریل، مهارکننده آنزیم تبدیل کننده آنژیوتنزین است و در درمان فشار خون و نارسایی قلبی کاربرد دارد. | کاپتۆپریل، ئەم دەوایە بە پێشگیریی لە کارتێکەریی ئانزیمێک کە هۆی گۆڕانی ئانژیۆتنزیمە دە بێتە هۆی هێنانەخوارەوەی کاری دڵ و پێویستیی دڵ بە ئۆکسیژێن. |
| cardiomyopathy | کاردیومیوپاتی، بیماری عضله ی قلب. | کاردیۆمیوپاتیی، نەخۆشیی ماسولکەی دل |
| cardiovascular | قلبی – عروقی | دڵ و دەمار |
| cephalosporins | سفالوسپورین‌ها، آنتی‌بیوتیک‌های باکتری‌کش که روی اکثر باکتریها اثر دارند. | سفالۆسپۆرینەکان، ئانتی‌بیۆتیکی باکتریی کوژن و کارتێکەرییان لە سەر زۆربەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | باكترييەكان هەيە. |
| chamber | اتاق، حفره، محفظه | ديو، ژوور |
| cholesterol | كلسترول | كۆلسترۆل |
| cocaine | كوكائين | كۆكائين |
| compression | فشارآوردن | فشارهاوردن، فشارهێنان، فشارهێنان |
| confusion | سردرگمي | شێواويي |
| congestion | احتقان، پرخوني | پۆنگخواردنەوە |
| constrictive pericarditis | پريكارديت بازدارنده، التهاب كيسه پريكارد مي‌تواند موجب سخت و ضخيم شدن پريكارد و چسبيدن آن به قلب شود. اين حالت با پيشگيري از انقباض و انبساط قلب و پرشدگي و برون دهي قلب موجب نارسايي قلبي مي‌گردد. | پريكارديتي بەرتەسك. هەوي توورەكەي پريكارد دەتوانێ ببێتە هۆي رەق و ئەستور بووني پريكارديوم ونووساني بە دڵ. ئەم حالەتە پێشگيريي لە گيربوونەوە و خاوبوونەوەي دڵ و پڕبوون و ناردني خوێن دەكا، دەتوانێ هۆي ناتەواويي دڵ بێ. |
| coronary heart disease | بيماريهاي كرونري قلب | نەخۆشيي كرۆنێريي دڵ |
| corticosteroids | كورتيكواستروئيدها، هورمون هاي كه درغدد فوق كليوي توليد مي‌شوند. از داروهاي كورتيكوستروئيدي براي درمان بيماريهاي مختلف التهابي و آلرژيک استفاده مي كنند. | كۆرتيكۆئستێرۆئيدەكان، هۆرمۆنگەلێكن كە لە لووي بانگورچيلە بەرهەم دێن و بۆ دەرماني نەخۆشييەكاني جۆراوجۆري ئالێرژيک و هەو كەڵكيان لێ |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەردەگیرێ. |
| coxsackieviruses | کوکساکی ڤایرۆس‌ها، این ڤایرۆس‌هایی عامل بیماریهای چون میوکاردیت، پریکاردیت وعفونت‌های سیستم تنفسی هستند | کۆکساکی ویروس، ئەم ڤایرۆسانەهۆی نە خۆشیی وەک هەوی ماسولکەی دڵ، هەوی دڵپۆش وچڵکی سیستمی هەناسەن. |
| defibrillator | دیفیبریلیتر، دستگاهی است کە تپش سریع قلب را بە حالت طبیعی برمی‌گرداند. | دی فیبریلیتێر، کەرەسەیەکە بۆ گەڕاندنەوەی خێراڵیدانی دڵ بە حاڵەتی ئاسایی. |
| depression | دپرسیون، افسردگی | دیپرێسیۆن، خەمۆکیی |
| diagnosis | دیاگنوز، تشخیص | دیاگنۆز، دەستنیشان کردن، دیاریی‌کردن |
| diastole | دیاستوله، انبساط قلب | دیاستۆلە، خاوبوونەوەی دڵ |
| digoxin | دیگوکسین، دارویی از گروه گلیکوزیدهای قلبی که موجب افزایش قدرت انقباض قلب می‌شود. | دیگۆکسین، دەوایەک لە گروپی گلیکۆزیدەکانی دڵ کە هۆی بەرزکردنی هێزی گرژبوونەوەی دلە. |
| dilated (congestive) cardiomyopathy | کاردیومیوپاتی متسع شده | کاردیۆمیوپاتیی والا |
| dilation | اتساع | والا، والابوون، هەراویی |
| diuretic | دیوریتک، مدر، ادرارآور | دیورێتیک، میزهێنەر |
| Dizziness ( vertigo) | گیجی | گێژی، گێژبوون |
| dopamine hydrochloride | دوپامین‌هیدروکلرید،یکی از داروهای آدرنرژیک است که موجب افزایش فشار خون و برون دهی قلب | دۆپامین‌هیدرۆکلۆرید، دەوایەکی ئادێرنێرژیکە کە دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری |

| | | |
|---|---|---|
| | میشود. | خوێن و پۆمپاژی دڵ. |
| dyspnea | تنگی نفس | هەناسەبڕکێ، نەفەس تەنگیی، پشووسواریی |
| echoviruses | اکوڤایرۆسها ، ڤایرۆسهایی که عامل سرما خوردگی ، میوکاردیت و مننژیت غیرعفونی میباشند. | ئکۆویروسەکان، ڤایرۆسگەلێک کە هۆی سەرمابوون، هەوی ماسولکەی دڵ و هەوی ناچڵکیی پەڕدەی مێشکن. |
| electric current | جریان الکتریکی | رەوتی ئەلیکتریکیی |
| electrocardiogram(EKG) | الکتروکاردیوگرام، نوار قلب | ئەلێکترۆکاردیۆگرام، نەواری دڵ |
| embolus | آمبولی، بندآوری که از لختههای جدا شده، توده باکتریایی و یا هرگونه جسم خارجی ایجاد شده، موجب مسدود شدن عروق شود. | ئامبۆلی، دەڵەمەی خوێن کە لە دیواری رەگەکان جیابۆتەوە، کۆمەڵی باکتریی و هەر چەشنە کەرەستەی بێگانە لە رۆیینی خوێندا کە دەبێتە هۆی بەسترانی رەگەکان. |
| endocardium | اندوکاردیوم، اندوکارد، لایه داخلی قلب، درون شامهی قلب | ئێندۆکاردیوم، نێوپۆشی دڵ |
| epicardium | اپیکاریوم، اپیکارد، روشامهی قلب | ئێپیکاردیوم، روپۆشی دڵ |
| epidemiology | همهگیرشناسی، اپیدمولوژی، واگیرشناسی | پەتاناسیی، پەتازانیی، ئێپیدیمۆلۆژیی |
| epinephrine | اپینفرین (آدرنالین)، هورمونی است که در غده فوق کلیوی تولید شده، نوع دارویی آن موجب افزایش | ئێپینێفرین(ئادەرنالین) هۆرمۆنێکە کە لە لووی بانگورچیلە بەرهەم دێ؛ چەشنی دەوای |

| | | |
|---|---|---|
| | ضربان قلب و فشار خون می‌شود. | ئادەرنالین دەبێتە هۆی زێدە لێدانی دڵ و فشاری خوێن. |
| estrogen | استروژن، هورمون جنسی زنان | ئستڕۆژێن، هۆرمۆنی جنسیی ژنان |
| fiber | فیبر،رشته، لیف | فیبر، ریشاڵ |
| fluid | فلوید، مایع، آبگونه | شلەئاو، شلەئاسا، ئاوەکیی |
| fluttering | تپش سریع و منظم قلب | لێدانی خێرا و رێک و پێک |
| function | فونکسیون، عمل | فونکسیۆن، کار |
| furosemide | فوراسمید، داروی ادرارآور | فورۆسئمید، دەوایەکی میزهێنەرە |
| gentamicin | جنتامیسین، آنتی بیوتیکی از گروه آمینوگلیکوزیدها که روی اکثر باکتریهای گرام مثبت و منفی اثر دارد. | ئانتی بیۆتیک لە گروپی ئامینوگلیکۆزیدەکان، کە کارتێکەریی لە سەر زۆربەی باکتریی‌یەکانی گرام ئەرێنیی و گرام نەرێنیی هەیە. |
| heart attac | حمله قلبی | هێرشی دڵ |
| heart failure | نارسایی قلبی | ناتەواویی دڵ |
| heart palpitation | تپیدن سریع قلب | دڵەکوتەی خێرا |
| heart transplant | پیوند قلب | چاندنی دڵ، پێوەندی دڵ |
| heart valve disorders | بیماریهای دریچه قلب | نەخۆشیی‌یەکانی دەریچەی دڵ |
| hemochromatosis | هموکروماتوز، انباشت غیرطبیعی آهن در بدن. | هێمۆکرۆماتۆز، کۆبوونەوەی نائاسایی و لە رادەبەدەری ئاسن لە جەستەدا. |
| hemoptysis | هموپتز، استفراغ خون | رشانەوەی خوێن |

| | | |
|---|---|---|
| heparin | هیپارین، ماده درمانی که از لخته شدن خون جلوگیری می‌کند | هێپارین، دەوایەکە کە پێشگیریی لە بەرهەم هاتنی دەڵەمەی خوێن دەکا. |
| hepatomegaly | هماتومگالی، بزرگ شدن غیرطبیعی کبد. | هێپاتۆمێگالیی، گەورە بوونی نائاسایی جەرگ. |
| hydralazine | هیدرالازین، داروی متسع کننده عروق که در درمان فشارخون کاربرد دارد. | هیدرالازین، ئەم دەوایە دەبێتە هۆی هەراویی رەگەکان و هێنانە خواری فشاری خوێن. |
| hypercalcemia | هیپرکالسیمی، افزایش کالسیم خون | هیپرکالسیمی، زۆربوونی کالسیۆمی خوێن |
| hypertrophic cardiomyopathy | کاردیومیوپاتی هیپرتروفیک | کاردیۆمیوپاتیی هیپێرترۆفیک |
| hypertrophy | هیپرتروفی، بزرگ و ضخیم شدن اندام یا بافت که نتیجه بزرگ شدن سلول های آن می‌باشد. | هیپێرترۆفیی، گەورە و ئەستووربوونی ئەندام یان تان کە بەرهەمی گەورە بوونی سیلولەکانیانە. |
| hypervolemia | هیپروالیمی، افزایش غیرطبیعی حجم مایعات بدن. | هیپێروالێمیی، زۆربوونی نائاسایی شلەی جەستە. |
| hypocalcemia | هیپوکالسیمی، کاهش کلسیم خون | هیپۆکالسیمیی، کەم بوونی کالسیۆمی خوێن |
| ibuprofen | ایبوپروفن، داروی ضدالتهابی غیراستروئیدی و مسکن. | ئیبۆپروفن، دەوای دژەهەوی نائسترۆئیدی و ئازارشکێن. |
| idiopathic | ایدیوپاتیک، ناشناخته، نامعلوم | نەناسراو، نادیار |

| | | |
|---|---|---|
| infective endocarditis | اندوکاردیت عفونی | ئێندوکاردیتیی چڵکیی، هەوی چڵکیی نێوپۆشی دڵ |
| isoniazide | ایزونیازید، آنتی‌بیوتیکی که در درمان بیماری سل کاربرد دارد. | ئیزۆنیازید، ئانتی‌بیوتیک، کە بۆ دەرمانی سیل کە ڵکی لێ وەردەگرن |
| kidney failure | نارسایی کلیه | ناتەواویی گورچیلە |
| left - sided heart failure | نارسایی بخش چپ قلب | ناتەواویی بەشی چەپی دڵ |
| Menopause (female climacteric) | یائسگی | نەشۆریی، یائسەگی، کۆتایی هاتن بەسووڕی مانگانە |
| metoprolol | متاپرولول، دارویی از گروه بتابلوکرها که موجب پایین آوردن کار قلب و کاهش نیاز قلب به اکسیژن می‌شود. | متاپڕۆلۆل، دەوایەک لە گروپی بێتابلۆکێرەکان کە دەبێتە هۆی هێنانەخوارەوەی کاری دڵ و پێویستیی دڵ بە ئۆکسیژێن. |
| mitral valve | دریچه میترال، این دریچه در بین دهلیز و بطن چپ قلب قرار دارد | دەریچەی میترال، دەربیجەی دوو پەڕە، ئەم دەریچەیە لە بەینی دالان و سکۆڵەی چەپدایە. |
| myocardial infarction | سکته قلبی | سەکتەی دڵ |
| myocarditis | میوکاردیت، التهاب عضله قلب | میوکاردیت، هەوی ماسولکەی دڵ |
| myocardium | میوکاردیوم، میوکارد، عضله قلب | میۆکاردیوم، ماسولکەی دڵ |
| nitroglycerin | نیتروگلسیرین،دارویی از گروه نیترات‌ها که موجب اتساع سرخرگ‌ها و | نیترۆگلیسیرین، دەوایەک لە گروپی نیتراتەکان کە دەبێتە هۆی والا کردنی |

| | | |
|---|---|---|
| | افزایش خونرسانی قلب می‌شود. | خوێنبەرەکان و بەرزکردنەوەی میزانی گەڕانەوەی خوێن بۆ دڵ. |
| osler nodes | غده اوسلر، گره ریز و دردداری که در اندوکاردیت عفونی درزیر پوست انگشتان دست و پا درست می‌شود. | گرێی ئوسلێر، لە هەوی ژێرکتوپڕی نێوپۆشی دڵدا گرەی ورد و ئێشدارە کە لە ژێرپێستی قامکەکانی لاق و دەست پێک دێ. |
| pacemaker | ضربان‌ساز | ترپە ڕێکخەر |
| palpitation | تپیدن قلب، تند زدن قلب | دڵەڕەپە، دڵەکوتە |
| papillary muscle | عضله پاپیلر، گروهی از رشته بافت‌های میوکارد قلب که به دریچه‌های دهلیزی - بطنی متصل می‌باشند. | ماسولکەی پاپیلیار، مەمە ماسولکە، گروپێک لە ریشالەکانی ماسولکەی دڵ کە بە دەریچەکانی دالانی - سکۆڵە نووساون. |
| penicillins | پنیسیلین ها، گروهی از آنتی بیوتیک های باکتری کش هستند که برروی اکثر باکتریها اثر دارند. | پنیسیلینەکان، گروپێک لە ئانتی‌بیۆتیکەکانی باکتریی‌کوژن کە کارتێکەرییان لە سەر زۆربەی باکتریی‌یەکان هەیە. |
| pericardial fluid | فلوید پریکاردیال، مایعی که در بین دو لایه برون شامه‌ی قلب قرار دارد. | شلەئاوی پریکاردیوم. شلەئاوی نێو دووچینی دڵپۆش. |
| Pericardiectomy | پریکاردیواکتومی، برش و جدا کردن برون شامه از طریق جراحی. | پریکاردئکتۆمیی، بڕین و جوێکردنەوەی پریکارد لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| pericardiocentesis | پریکاردیوسنتز، تخلیه مایع برون شامه ی قلب از طریق کاتتر یا سوزن میان تهی. | پریکاردیۆسێنتێز. خاڵی کردنی و دەرکێشانی شلەئاوی نێو توورەکەی پریکارد لە ڕێگای ڕۆکردنی دەرزیەکی نێو خاڵی یا کاتێتر. |
| pericardium | پریکاریوم، پریکارد، برون شامەی قلب | پریکاردیوم، پریکارد، دڵپۆش |
| peripartum | پری پارتوم، سه ماه آخر حاملگی یا شش ماه اول بعد از زایمان. | پریپارتوم، سێ مانگی ئاخری دووگیانی ژن یان ٦ مانگی دوای زایین. |
| phenothiazines | فنوتیازین ها، گروهی از داروها که در معالجه بیماریهای روانی چون اسکیزوفرنی کاربرد دارند. | فنۆتیازینەکان، گروپێک لە دەواکان کە بۆ دەرمانی نەخۆشییەکانی ڕۆحیی وەکو شیزۆفێرنی بەکار دەبردرێ. |
| pounding | سخت تپیدن قلب | دڵەتەپەی سەخت، دڵەرەپە |
| propranolol | پروپرانولول، دارویی از گروه بتابلوکرها که موجب پایین آوردن کار قلب و کاهش نیاز قلب به اکسیژن می شود. | پرۆپرانۆلۆل، دەوایەک لە گروپی بێتا بلۆکێرەکان کە دەبێتەهۆی هێنانەخوارەوەی کاری دڵ و پێویستیی دڵ بە ئۆکسیژێن. |
| proxysmal noctural dyspnea | تنگی نفس حمله ای شبانه | هێرشی شەوانەی پشووسواریی |
| pulmonary artery | سرخرگ ریوی | خوێنبەری سیپەلکیی |
| pulmonary congestion | احتقان ریوی، پرخونی ریه | پۆنگخواردنەوەی سیپەلک |

| | | |
|---|---|---|
| pulmonary edema | خیز ریوی، ورم ریوی | ماسینی سیپەلک |
| pulmonary valve | دریچه ریوی، این دریچه در بین بطن راست و شریان ریوی قرار دارد. | دەریچەی سیپەلکیی، ئەم دەریچەیە لە نێوان سکۆڵەی راست و خوێنبەری سیپەلکییدایە. |
| pulmonary vein | سیاهرگ ریوی | خوێنهێنەری سیپەلکیی |
| radiation therapy | اشعه درمانی | تیشک دەرمانیی |
| regurgitation | بازگشت، پس راندن، برگرداندن | گەڕانەوە، گەڕاندنەوە |
| restrictive cardiomyopathy | کاردیومیوپاتی بازدارنده، کاردیومیوپاتی رستریکتیو | کاردیۆمیوپاتیی بەرتەسک |
| rheumatic fever | تب روماتیک،عفونت استرپتوکوکی گلو. | یاوی رۆماتیسمیی، هەوی چڵکیی گەرو کە سەرچاوەی سترێپتوکۆکیی هەیە. |
| rheumatid arthritis | روماتید آرتریت، روماتیسم مفاصل | روماتید ئارتریت، روماتیسمیی جومگە. |
| rhythm | ریتم، آهنگ | ریتم، ئاهەنگ |
| right- sided heart failure | نارسایی بخش راست قلب | ناتەواویی بەشی راستی دڵ |
| sarcoidosis | سارکوئیدوز، بیماری سیستمیک و مزمن با علت نامعلوم است. دربیشتر بافتها و اندامهای بدن گرههای بسیار ریزی ایجاد میشود که به آنها گرانولوم میگویند. | سارکۆئیدۆز، نەخۆشییەکی دریژخایەنی سیستمیکە ( گشتییە) کە هۆیەکانی نەناسراوە. لە زۆربەی ئەندامەکانی جەستە گرە ی زۆر ورد بەئەندازەی شەکر یان خیز بەرهەم دێ کە پێیان گرانولۆم دەکوترێ. |

| | | |
|---|---|---|
| septum | دیوار | دیوار |
| shock | شوک | شۆک، راتەکاندن |
| sinus node | گره سینوسی، این گره در دهلیز قلب قرار داشته؛ جریان الکتریکی در آن ایجاد می‌شود. | گرێی سینوسیی، ئەم گرێیە لە دالانی راستی دڵ جێگیربووە، بەرهەمهێنەری رەوتێکی ئەلیکتریکی‌یە. |
| spasm | اسپاسم، گرفتگی عضله | گرژیی، گرژیی ماسولکە |
| sporadic | پراکنده، گهگاهی، تک و توک | بڵاوە، جاروبار |
| staphylococcus | استافیلوکوک، گروهی از باکتریهای گرام مثبت | ستافیلۆکۆک، گرۆپێک لە باکتریی‌یەکانی گرام ئەرێنیی |
| stenosis | استنوز، تنگی، تنگ شدن | تەنگبوون، تەنگیی، |
| streptococcus | استرپتوکوک، گروهی از باکتریهای گرام منفی | سترێپتۆکۆک، گرۆپێک لە باکتریی‌یەکانی گرام نەرێنیی |
| streptokinase | استرپتوکیناز، آنزیمی که موجب از بین رفتن لخته های خون می‌شود. | ستزێپتۆکیناز، ئانزیمێکە کە دەڵەمەی خوێن لە نێو دەبا. |
| stress | استرس، تنش عصبی، فشارعصبی | سترێس، نائارامیی |
| subacute endocarditis | اندوکاردیت زیرحاد | ئێندۆکاردیتیی ژێرکتوپڕ؛ هەوی ژێرکتوپڕی نێوپۆشی دڵ |
| sulfonamides | سولفونامیدها، گروهی از آنتی بیوتیک‌ها که جلوگیری از رشد باکتری می‌کنند. | سولفۆنامیدەکان، گروپێک لە ئانتی‌بیوتیکەکان کە پێشگیریی لە بارهاتن و پەرەگرتنی باکتریی |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەکەن. |
| symptom | نشانه بیماری | نیشانەی نەخۆشیی |
| synchronize | هماهنگ و همزمان بودن | هاوکات و ریک و پێک بوون |
| syncope | سنکوپ، بی‌هوش شدن، بی هوشی | بورانەوە، بێهۆش بوون، بێهۆشیی |
| systole | سیستوله، عمل انقباض قلب | سیستۆلە، گرژبوونی دڵ |
| tachycardia | تاکیکاردی، افزایش ضربان قلب | تاکیکاردیی، خێرالیدانی دڵ |
| tamponade | تامپوناد، افزایش مایع آب شامه ی قلب موجب فشارآوردن به قلب میشود. | تامپۆنادی دڵ. زۆربوونی له رادەبەدەری شلەئاوی نێو توورەکەی پریکارد کە دەبێتە هۆی فشار هاوردن بە دڵ. |
| tetracycline | تتراسیکلین، آنتی بیوتیکی است که از رشد باکتری جلوگیری می‌کند. | تیتراسیکلین، ئانتیبیوتیکێک کە پێشگیریی لە بارهاتن و پەرەگرتنی باکتریی دەکا. |
| the circulatory system | سیستم گردش خون | سیستەمی سوورانەوەی خوێن |
| thorax | قفسه سینه | ڕکەی سنگ، قەفەسەی سنگ |
| thromboembolism | ترومبوآمبولیسم، جدا شدن لخته خون از جداره عروق و حرکت آن درسیستم گردش خون. | ترۆمبۆئمبۆلیسم، جوێبوونەوەی لەختەی خوێن لە دیواری رەگەکان و رۆیینی بۆ نێو سیستەمی گەڕانی خوێن. |
| thrombosis | ترومبوز، لخته شدن خون | ترۆمبۆز، دەڵەمەبوونی |

| | | |
|---|---|---|
| | | خوێن، لەختەی خوێن |
| thrombus | لخته | لەختە، دەڵەمە، لک |
| thumping | تاپ تاپ کردن قلب | تەپ تەپ کردنی دڵ |
| thyrotoxicosis | تیروتوکسیکوز، پرکاری غده تیروئید. | تیرۆتۆکسیکۆز، لە رادەبەدەر کارکردنی لووی تیرۆئید. |
| tonsillectomy | برش و جداکردن لوزه از طریق جراحی. | بڕین و دەرهینانی ئاڵوو (لەوزەتین) لە ریگای نەشتەرگەرییەوە. |
| toxin | توکسین، زهر، زهرابه | ماددەی ژەهراویی |
| tricuspide valve | دریچه تریکوسپید، این دریچه در بین دهلیز و بطن راست قلب قرار دارد. | دەریچەی تریکۆسپید، دەربیجەی سێ پەڕە، ئەم دەریچەیە لە بەینی دالان و سکۆڵەی راستی دڵدایە. |
| trycyclic antidepressants | تری سیکلیک های آنتی دپرسانت، داروهای ضد افسردگی که پیشگیری از جذب نوراپینفرین و سروتونین در نورون‌ها میکنند. | تریسیکلیک ئانتیدێپریسانت، ئەم دەوایانە پێشگیریی لە راکیشانی نورئپینئفرین و سروتۆنین بۆ نێو نورۆنەکان دەکەن ۆ بۆ دەرمانی خەمۆکیی کەڵکیان لێ وەردەگرەن. |
| tuberculosis | سل | سل |
| valve replacement | تعویض دریچه قلب | گۆرانی دەریچەی دڵ |
| vancomycin | وانکومیسین، آنتی بیوتیکی است که بر بیشتر باکتریهای گرام مثبت و منفی و بویژه استافیلوکوک و استرپتوکوک اثر دارد. | وانکۆمێسین، ئانتیبیۆتیکێکە کە کارتێکەریی لەسەر زۆربەی باکترییەکانی گرام ئەرێنیی، بە تایبەت |

| | | |
|---|---|---|
| | | ستافیلۆکۆک و ستریئپتۆکۆک هەیە. |
| vasculitis | واسکولیت، التهاب عروق | واسکولیت، هەوی رەگەکان |
| vegetation | زخمی که نتیجه انباشت و بهم چسبیدگی غیرطبیعی میکروب ها در بافت یا اندام است. | برینێک کە بەرهەمی کۆبوونەوە و بە یەک نووسانی نائاسایی میکروبەکان لە تان یان ئەندامە. |
| vein | سیاهرگ | خوێنهێنەر |
| vena cava | سیاهرگ کاوا، خون بازگشتی از بدن از طریق دو سیاهرک کاوا وارد دهلیز راست میشود. | خوێنهێنەری کلۆرە، خوێنی گەڕاوەی جەستە لە ڕێگای دوو خوێنهێنە ری کلۆرە دەڕژێتە نێو دالانی راستی دڵ. |
| ventricle | ونتریکول، ونتریکل، بطن قلب | وێنتریکل، سکۆڵە |
| ventricular arrythmias | آریتمی بطنی، بی نظمی ضربان بطن قلب | ناڕێک لێدانی سکۆڵەی دڵ |
| verapamil | وراپامیل، دارویی از بندآورهای کانال کلسیم که موجب پایین آوردن قدرت انقباض قلب و در نتیجه کاهش نیار قلب به اکسیژن می شود. | وێراپامیل، دەوایەک کە هۆی بەسترانی کانالەکانی کالسیۆمی دڵ و هینانەخوارەوەی هێزی گرژبوونەوەی دڵ و پێویستیی دڵ بە ئۆکسیژێنە. |
| wheezing | خس خس کردن | خیزەی سنگ |